## شەشەم: فیقهـی دونیا و فیقهـی ئاخیرەت (فراوانتر لە قانوون)

فیقهـ کاتێک بە تەنها لە دیووە زەمەنییەکەیدا دەمێنێتەوە. لە دیققەتدا کاری خۆی ئەنجام دەدات، فیقهـ جگە لەم کارە کارێکی دیکەی نییە، لێ کێشە لەوەدایە کاتێ فیقهـ دێت و هەموو جومگەکانی ژیان دەگرێتەوە بەجۆرێک کە تۆسقاڵێک دەرفەت بۆ رەهەندەکانی دی و تێگەشتنەکانی دی ناهێڵێتەوە. کارەساتی گەورە لێرەدا دەخولقێت.

فیقهـ هەمان دیووە قانوونییەکەی ژیانە و لەمبارەوە لەنێوان قانوون و فیقهدا وەکو میتۆد هیچ جیاوازیەک نییە. فیقهـ قسە لەسەر پرسەکانی رۆژ دەکات و لەبارەیانەوە بە ئەرێ و نەرێ فەرمان دەر دەکات، فیقهـ دێت و یاسایەکی گشتی فەرز دەکات، دێت و لەهەمبەر کۆمەڵگەدا کۆمەڵێک ئەبێ و نابێ دەخاتە بەردەم و پێشکەشی دەکات، لێرەوە کۆمەڵگە لەبەردەم ئەم ئەبێ و نابێیانەدا خۆی دەبینێتەو، کە ئەمە لە راستیدا هەمان قانوونە و رۆڵی قانوون دەبینێ، بەلام دەتوانین ناوی لێبنێین قانوونی ئیسلامی. تازە قانوون لەمرۆدا جەخت لەسەر ماف دەکاتەوە، ئەمەو لەکاتێکدا فیقهـ زیاتر ئەرکدارانەیە و جەخت لەسەر ئەرکەکان دەکاتەوە، بە گوتەی سروش: کۆمەڵگەی ئیسلامی چونکی کۆمەڵگەیەکی فیقهی و فیقهدارییی بوو زیاتر جەختکردنەوەبوو لە دیوی ئەرکداریی، لێ قانوونی ئەمرۆ زیاتر مافدارییە. سروش پێی وایە کۆمەڵگەی تەندرووست لەم نێوانەدا هاوسەنگی خۆی دەپارێزێ.

لە زانستی فیقهـ و چوارچێوەی جیهانبینی فیقهیدا رەنگەکانی دیکە دەکەونە ژێر پرس و چاودێرییەوە، چونکە فیقهیش وەکو قانوون لەسەر بنەمایەکی گشتی چاودێری و قالَبی ئەبێ و نابێتدا خۆی دەبینێتەوە. لێرەدا فیقهـ نەک تەنها فەرمانێکی قانوونییە، بەڵکو حکومەتێکی جەبباریشە و لێرەوە هەموو ئەو چتگەلەی کە نابەفەرمانی ئەون دەکەونە بەر نەشتەرگەری توندی خواستەکانییەوە، بەمەش حکومەتی فیقهی جێگەی حکومەتی ئیسلامی دەگرێتەوە.

حکومەتی فیقهی دەیەوێ وێنای حکومەتی ئیسلامی بکات و حکومەتی ئیسلامیش لێرەدا دەکەوێتە ناو بۆسەی ئایدۆلۆژیاوە، هەر بۆیە هەموو بنەماکانی فرەگەرایی (پلۆرالیزم) دەخاتە ژێر پرسیارەوە و نایەڵێ تێگەشتن و بۆچوون و ئاین و نەتەوەکانی دی وەک پێویست هەناسە بدەن، ئەمەش دەبێتە گەورەترین مەترسی حکومەتی فیقهی بۆ سەر کۆمەڵگە و ئازادیەکانی، هەروەها بۆ سەر نەتەوە و مافەکانی.

لێرەویە بەدرێژایی مێژوو دەبینین کە نەتەوەیەکی وەک نەتەوەی کورد بووە بەژێر حکومەتە فیقهییەکانی مێژووەوە و خواست و ئازادی و ویستەکانی پێشێلکراون. هەموومان دەزانین کە تەواوی ئەو کوشتن و برینانەی کە سەرتاپای مێژووی ئیسلامی تەنیووە هەموویان بە دیوە سیاسی¬/فیقهیەکەی ئاینەوە لکاون و تا ئێستاکەش بە سەوقات بۆ ئێمە ماونەتەوە.

## حەوتەم: دەرەنجامەکانی ئاینی فیقهی

ئاینی فیقهی کۆمەڵێک دەرەنجام بەدەستەوە دەدات کە ئێمە لێرەدا تەنێ دەیانژمێرین و زۆر لەسەریان راناوەستین، لەوانە:

١- نەمانی فرەیی (پلۆرالیزم).

٢- دابەشبوونی کۆمەڵگە بۆ دوو بەرەی رەش و سپی.

٣- رەنگێک و نەمانی رەنگەکانی دی.

٤- تەنگ بوونەوەی مەوداکانی ئازادی.

٥- کۆمەڵگەی دووڕوو، وەک نیقابی هەقیقەت.

٦- تەقلید و کوشتنی ئازادی مەعریفی.
٧- فیقهـ وەک زانستێکی بەکارهێنەرە نەک داهێنەر.

فرەیی هێمای کۆمەڵگەی تەندرووستە و ئەمرۆکە خاڵێکی وەرچەرخان و بەرچاو و گرنگی پێکەوە ژیانی نەتەوەکانی دیکە و دیموکراسی بریتیە لە پێکەوە ژیان، ئەمەش کاتێک دەبێ کە قبووڵی ئەوە بکەین کە نەتەوە و ئاینزا و ئاینەکانی دیکەش لەسەر هەق و ڕاستین بە ئەندازەی تێگەشتن و پشکی هەر ئاینێک لە هەقیقەت. ئەم تێگەشتنە لە خودا و ناوەکانی وەختێ جیلوە دەبێ کە تێگەشتن بۆ دەق زیاتر لە فیقهـ دەڕوات و فیقهـ و چوارچێوەکانی جێ دێڵێ.

وەلێ فیقهـ ناتوانێ فرەیی هەرس بکات، چونکە بە تێگەشتنی فیقهی تەنها ئاینی ڕاست ئاینی ئیسلامە و لەوێشەوە تەنها ئاینزایەکی دیاریکراو، کە زۆر جار جەنگ و کوشتار لە نێوان فەتوای کۆنە و تازەی ئاینزایەک، یان مەزهەبێک ڕوویداوە و مەترسی بووە بۆ سڕینەوەی ئاینزایەکی دی، یان بە کافر زانینی شوێنکەوتووەکانی. تازە لێرەدا تەنگکردنەوەی دین بۆ تێگەشتنی فیقهی لەباشترین دەرەنجامدا بۆ ڕەتکردنەوەی تێگەشتنەکانی دیکەی وەک شێعە لەلایەن سوونی و سوننی لەلایەن شێعەوە.. هەوەها ماتریدی و زەیدی و ئیمامی.. تاد دێ.

لەلایەکی دیەوە یەک لە هەرە بنەما گرنگ و هەستیارەکانی ئیسلام بریتیە لە حوکمڕانی ئیسلامی و سیاسەتی ئەمڕۆی ئیسلامی کە فیقە هەژموونی هەیە بەسەریا و ئاراستەی دەکات، ئەگەر لە ڕابردوودا کەلامی ئیسلامی قسەیەکی هەبووبێ تێیدا، ئەمرۆکە بەتەنێ فیقهـ پێشەوایەتی سیاسەتی ئیسلامی و ئیسلامی سیاسی و هەموو جومگەکانی دەکات، ئەمەیش مەترسیەکی گەورەیە گەر سەرنجی لەسەر دابنێین.

**ئەو کوشتن و بڕینانەی کە سەرتاپای مێژووی ئیسلامیی تەنیووە هەموویان بە دیوە سیاسییە فیقهیەکەی ئایینەوە لکاون و تا ئێستاش بە سەوقات بۆ ئێمە ماونەتەوە**

دینی سیاسی بەزۆری جۆرێکە لە تێکەڵکردنی ئایدۆلۆژیا بە فەرمانە فیقهی و دەستوورە گشتیەکانی، لێرەوە ئایدۆلۆژیا تێکەڵا دەبێ بە سیاسەت، کە ئایدۆلۆژیا کاتێ بەر حوکمڕانی دەکەوێ ئیدی دوچاری جۆرێک لە گەوجاندنی سیستماتیکی دەکات.

هەرچەندە وا خۆی دێنێتە حزوور کە فریادڕەسە و ڕێگایەکە بۆ دەربازبوون لە تەنگژە و دەرچەیەکە بەڕووی ئازادیدا، لێ زۆری پێناچێ کە بۆخۆی دەبێتە کۆسپ لەبەردەم ئازادی بیر و ڕاکاندا، ئیسلامی سیاسی ئەگەرچی وێنای ئیسلام دەکات، لێ تەفسیرێکە لە ئیسلام وەکو باقی دیکەی تەفسیرەکان کە بە زۆری و لە باشترین حاڵەتدا پشتی بە ئاینی فیقهی بەستووە.

کاتێ پەڕەکانی مێژووی ئیسلامی هەڵدەدەینەوە دەبینین ئیسلامی فیقهی/سیاسی بە گشتی نەوینترین ئاستی تێگەشتنە لە وجوود و خودا و ئینسان، هەروەها نزمترین ئاستی تێگەیشتنیشە لە دەقی دینی، چونکە تەفسیری سیاسی ئاتاجی تەفسیری فیقهییە لە دین و تەفسیری فیقهیش بەکارهێنەرترین جۆری زانستی ئیسلامییە.

فیقهـ زانستێکی بەکار هێنەرە و مەرتەبەیەکی نزمی هەیە، ئەبوحامیدی غەزالی لە موستەصفادا بە ڕاشکاوی ئەوە ڕادەگەیەنێ کە فقیهە بەبێ تێگەشتن

له بنچینەکانی دین، هیچی پێناکرێ. هەروەها غەزالی دەڵێ: تێگەیشتنیش لە ئوصوولا هەموو چتێ نیە و زانستی ئوصوولیش ئەگەرچی داهێنەری فیقهـە، لێ لە خۆیدا هەم بەکارهێنەرە هەم ڕوتبەی لە خوار زانستی کەلامەوەیە، چونکە لە زانستەکانی کەلام و فەلسەفەوە ڕاستیە بنچینەییەکانی جیهان¬ناسی و مرۆڤ¬ناسی خواناسی وەردەگرێ.

غەزالی لە موستەصفادا - کە ئیبن خەلدوون بە گەورەترین کتێبی ئوصوولی مێژووی ئیسلامی هەژماری دەکات- دەڵێ: بابای کەلامی (متکلم) بەرپرسی یەکەمە لە چەسپاندنی بنەما گشتیەکانی هەرچی زانستی دینی هەیە، کە زانستەکانی دی بە نیسبەت ویەوە بەشەکین، پاشان جەخت دەکاتەوە و دەڵێ: زانستی کەلام بەرزترین ڕوتبەی هەیە بەسەر زانستەکانی دیەوە، لێ زانستی فیقهـ زانستێکی بەکار هێنەرە و بەڵکو زانستێکی بەشەکی یە، بگرە زانستی ئوصوولا کە بە ڕوتبە پێش فیقهـ دەکەوێ و بەبێ شارەزایی تەواو لەو زانستە فەتوای فیقهی نادرێ، کەچی ئەویش هەم بەکار هێنەرە و هەمیش لاوەکی لەچاو کەلامدا، هەروەها لە زانستی کەلامەوە هەقایقە بنچینەییەکانی خۆی وەردەگرێ. بەم تێڕوانینە زانستەکان یەکدی تەواو دەکەن و بەسەر یەکدا ئاگاییان هەیە و لەهەموویشی گرنگتر هەم سنووریان دیاریکراوە و هەم کەم و کوڕیەکانیان، ئەمەو لە کاتێکدا غەزالی لە چەندین جێگادا توند نەقدی دینی تەقلیدی دەگرێ و ڕازیبوون بە زانستی تەقلیدی و تەقلیدکردن بە کۆسپێکی گەورەی بەردەم هەقیقەت و یەقین هەژمار دەکات.

پێویست بوو هەموو ئەو خاڵانەی کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدان لەسەریان ڕاوەستم، بەڵام لێرەدا بە باشی دەزانم ئەوە بسپێرم بە کۆڵینەوەیەکی دیکە و لە بەشێکی دیکەیدا بە درێژی لەسەریان بدوێم.

**دەرەنجام و ڕێچارە.**

ئاینی ئیسلام ئیمتیازی لەوەدایە کە گەورەتر لە تێگەشتنێکە، پێویستە تەنها لە یەک ڕەهەندە وە نەڕوانینە دەقی دینی، ئەمەش تەنها بانگەشە نییە، پێویستە پێداچوونەوە بە مێژوودا بکەین و بە بوێرانە نەقد لە ڕابردووی خۆمان و ئایندارێمان بگرین، هەروەها حەدد و سنووری زانستەکان بەباشی بناسین، ئەم کارەیش هەم کاری دەستە جەمعی دەوێ هەم کۆششی تاک و پسپۆڕی.

پسپۆڕی لەبوارەکاندا دەرچەیەکی باشە بەڕوی تێگەشتن لە کەلتوور و شارستانییەتەکان، هەروەها ئەوە قبووڵبکەین کە خوا بزوانی ژیانی بەڕووی شارستانییەتدا دەوێ، بەڵێ شارستانییەتی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا کەم و کوڕی زۆرە، لێ ئەمە مانای وا نییە کە ئەو شارستانییەتە هەمووی ناشیرینە و دژی خوایە و دژی مرۆڤایەتیە. مودێرنیتە هەمووی فاسید نییە، بەڵکو خەبات و ڕەنجی هەزاران ساڵەی مرۆڤایەتیە.

بەرگریکردن لە دینی فیقهی و سیاسی وەک دەرکەوتەیەکی مێژوویی و وەک تەفسیرێک لە ئیسلام بەکۆمەڵێک هەل و مەرجی تایبەتەوە شتێکی سرووشتییە و کارێکە کە دەبێ بکرێ و نابێ نەکردە بگیرێ، بەڵام ئەوەی قورس و ناسرووشتیە ئەوەیە هێشتاکە نەتوانی لە هەژموون و پاڵەپەستۆی ئەو تەنها تەفسیرە دەرچیت و لە ژێرکاریگەریەکانی بە باش و خراپیەوە بمێنیتەوە! هێشتا نەتوانی قسەیەکت بۆ مێژوو هەبێت و نەتوانی نەقدی ڕابردووی خۆت -کە بەشێکە لە کەلتوور و فەرهەنگت- بگری و نەتوانی ئیزافەیەکت هەبێ! هێشتا نەتوانی لە ئیگۆی ئەو ڕووداوە مێژووییانە دەربازبی! کە ئەمە برێکی بۆ خراپی دۆخی ئەمڕۆکەی جیهانی ئیسلامی بە گشتی و کۆمەڵگەی کوردی بەتایبەت دەگەڕێتەوە، چونکە بەبێ نەقدی ڕابردوو ناتوانین

یەک خشت بخەینە سەر دایواری داهاتوومان. خودا هیچی تەقلیدانەی پێ خۆش نیە، نە دینی تەقلیدی نە شوێنکەوتنی تەقلیدی و نە دووبارەکردنەوەی شتگەلی ڕابردوو، خودا خۆشی لە مەملووکیەت نایەت، خودا خۆشی لە داهێنان و تازەیی دێت و خۆی بەدیعی زەوی و ئاسمانەکانە و هەمیشە و بەردەوام بەرگی تازەیان بە بەردا دەکات و جلی نوێیان پێ دەپۆشێ (كل يوم هو في شأن).

فیقهـ زەمانێکی زۆر و پانتاییەکی زۆری داگیر کردووە، چیتر کاتی ئەوە هاتووە بوێرانە نەقدی شافعی و فیقهزانە گەورەکانی مێژوو بگرین، ئەوەیش گەورەترین خزمەتە بە ڕاستیەکان، هەروەها بەوانیش، زۆر شت هەیە ئەوان نەیانزانیووە و خواستیان بووە بیزانن، ئەوان ئەگەر ئێستاکە زیندوو بایەن نەقدی ڕابردووی خۆیان دەگرت، نەدەهاتن ڕابردووی خۆیان بپەرستن. هەر ئەو شتەی کە بۆ ئێمەیان جێهێشتووە و بەداخەوە ئێمە ئەنجامی نادەین.

شافعی لە سەردەمی خۆیدا و لە مێژووی عارەبی و ئیسلامیدا ڕاپەڕینێکی گەورەبووە

هەروەک ئەرەستۆ لە مێژووی گریکدا، لێ هەردووک شایانی ئەوەن کە نەقد بگیرێن، پێویستە لە ژێر ئەو هەژموونە ڕزگارمانبێ، ئاین تەنها فیقهـ نییە، ئاین لە لوتکەدا گەیشتنە بە خودا، خودا بە درێژایی مێژوو جیلوەی هەبووە و جیلوەی ئەو نە تەواو دەبێ و نە کۆتایی دێ، ناسینی خودا تەنها لە چوارچێوەیەکی فیقهیدا ئەوپەڕی جەفایە بە خودا، خودا تەنها دابەزین نییە بۆ زەوی، خودا بەرزبوونەوەی مرۆڤیشە بۆ ئەو دیووی زەمان و پچڕان لە زەمان، لە کۆتاییشدا دەڵێم وەک مەولانا دەڵێ پێویستە تێگەشتنمان لە خودا تەنها لە چوارچێوە فیقهیەکەی قەتیس نەمێنێ چونکە تێگەیشتن لە خودا سەفەری دەروونی دەوێت و ڕێگای دوور و درێژی دەروونی دەوێ بۆ ئەو دیوی زەمان و مەکان کە لە تەریقەت و حەقیقەتدا جیلوە دەبێ و خۆی دەنوێنێ:

**اطيب الاسفار عندى انتقالى من مكان**
**فالمكانات حجاب عن عيان اللامكان.**

**چونکە بەبێ نەقدی ڕابردوو ناتوانین یەك خشت بخەینە سەر دایواری داهاتوومان. خودا هیچی تەقلیدانەی پێ خۆش نیە، نە دینی تەقلیدی نە شوێنکەوتنی تەقلیدی و نە دووبارەکردنەوەی شتگەلی ڕابردوو، خودا خۆشی لە مەملووکیەت نایەت، خودا خۆشی لە داهێنان و تازەیی دێت**

## سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز.

٢. رسالەی موحەممەدی کوری ئیدریسی شافعی، شرۆڤەی: ئەحمەد موحەممەد شاکر، بێ چاپ، بێ بەروار.

٣. تەهانەوی، موحەممەد عەلی: مەوسوعەی کەششافی اصتلاحاتی فنوون و علووم، لوبنان، چاپی یەکەم، ١٩٩٦زاینی).

٤. بو عەلی سینا، شیفا، پێداچوونەوە: د. ئیبراهیم بەییومی مەدکوور، بڵاوکراوەی: زەوی ئەل قوربا، چاپی دووەم، چاپخانەی سلێمانزادە، بەروار: ١٤٣٤.

٥. بیگۆڤیچ، عەلی عیززەت: الاسلام بين الشرق و الغرب، تاران، چاپی یەکەم، ساڵ ١٣٧٤ هەتاوی.

٦. مەولانا، جەلالەدینی موحەممەدی بەڵخی، غەزەلیاتی شەمس. بڵاوکراوەی: سوخەن، تاران، چاپی هەوتەم، ١٣٩٣هەتاوی.

٧. جورجانی، سەید شەریف، کتێبی ئە تەعریفات، تەحقیق: عادل ئەنوەر خزر، داری ئەل مەعریفە، لوبنان، چاپی یەکەم ٢٠٠٧ز.

٨. بووزەید، نەصر حامید، مانای مەتن (پژوهشی در علوم قران)، وەرگێڕانی بۆ فارسی: مرتی کەریمی نیا، بڵاوکراوەی: تەرحی نوێ، چاپی یەکەم،١٣٨٠ هـ

٩. ئیدریس عومەر، ماستەرنامە: الاسلام بين المادە والروح، ساڵی ٢٠٠٩ز.

١٠. خەلیل، عمادەدین: التفسیرالاسلامی للتاریخ، - قوم، ئێران، بەبێ چاپ و ساڵی چاپ.

١١. نوورسی، سەعید، پیامەکانی نوور، مەسنەوی عەرەبی نووری. بەبێ چاپ.

١٢. غەزالی: إحياء علوم الدين، چاپی یەکەم: ١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٤ز).

١٣. غەزالی، المستصفی من علم الاصول، بێ بەروار، بێ چاپ.

١٤. غەزالی، ڕستگاری لە ناریکی، تەحقیق: جەمیل ئیبراهیم حەبیب، بەغداد،١٢٨٧هـ

١٥. ئەدۆنیس، الثابتوالمتحول، داری ئەل ساقی، چاپی دەیەم، لوبنان، ٢٠١١ز.

١٦. بووزەید، نەصر حامید، الاتجاه العقلي في التفسير، دراسة في قضية المجاز في القران عندا لمعتزله، بڵاوکراوە: المركز الثقافي العربي، داری ئەل بەیزا، چاپی پێنجەم، ٢٠٠٣ز.

١٧. عبد الحمید، محسن: الفكر الاسلامی، تقویمە وتجدیدە، (مکتبە دار الانبار، بغداد) چاپی یەکەم ١٤٠٨هـ- ١٩٨٧ز).

١٨. الوردی، علی: مهزلة العقل البشري، (دار الوراق للنشر، لندن) چاپی یەکەم، ٢٠٠٣ز.

# دیدگای بیرمەندانی ئیسلامیی بۆ

# کەلەپوور

**ئیسماعیل تەها**
بەکالۆریۆس لە زانستە ئیسلامییەکان.
چەند بەرهەمی ویرگێڕدراوی هەیە.
چەندین وتاری بڵاوکراوەی هەیە.

**قسەکردن لەسەر (کەلەپوور)ای ئیسلامیی، قسەکردنە لەسەر دەریایەکی بێ بن، بۆیە بەشێک[2] لە زانایان و بیرمەندانی هاوچەرخ کاتێك باسی کەلەپووری ئیسلامی دەکەن هەر کەسەو بە پێی باگراوندی خۆی باسی ئەو کەلەپوورە دەکات، بەهۆی کاریگەری گەورەی کەلەپوور بەسەر نەوە یەك لەدوای یەکەکان، بەیەکێك لە باسەر هەر زیندوەکان دادەنرێت، بەتایبەت هەندێك کردەی نامرۆڤانە هەیە، کە دەکرێت پاڵپشتیەکی لە کەلەپوور بۆ بدۆزنەوە، بۆیە بەردەوام قسەو باسی گرنگی لەسەر دەکرێت، لەم نێوەندەش کۆمەڵێك بیرمەندی گەورەی ئیسلامیی لە کتێبی سەربەخۆ باسی کەلەپووریان کردووە، هەرکەس لە دیدوتێروانی خۆیەوە شەنوکەوی کەلەپووری کردووە، لەم نووسینەدا، سەرەتا پێناسێکی کەلەپوور دەکەین، پاشان دەچینە سەر ئەوەی ئایا زانایانی پێشوو چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵکەلەپوورکردووە؟ کەسیان کەلەپووریان بەپیرۆز زانیوە؟ بەتایبەت بۆچوونی زانایانی ئیسلام لەم بارەیەوە گرنگە، چونکە ئەوەی ئێستا بەشێکی خەڵك ڕێگرن لەقسەکردن قسەوفەتواو ئیجتهادی ئەوانە، ئەگەرچی بەلای هەندێك خەڵکەوە قسەکردن لەسەر کەلەپوور قسەکردنێکی بێ سودە، پێویستە بەیەکجاری خۆمان لەم رابردووە داماڵین، بەڵام بەلای بیرمەند وفەیلەسوفێکی وەك (تەها عەبدوڕەحمان) خۆسەرقاڵکردن بەکەلەپوور بێسود نییە، پێیوایە ئەگەر مرۆڤ سەرقاڵ نەبوو بەکەلەپووری خۆیەوە سەرقاڵ دەبێت بە کەلەپووری خەڵکانی ترەوە[3].**

## پێناسەی کەلەپوور

سادەترین پێناسەی کەلەپوور بریتییە لە کۆی بەجێماوی نەوەکانی پێشوو، لە هەموو بوارەکانی سیاسیی، ئایینیی، کۆمەڵایەتیی و ئەدەبی هەمووی پێی دەگوترێت کەلەپوور، بەوپێیەی ئەم کەسە لەپێش ئێمەوە کۆچی دوای کردووە، نووسینی کەسانی وەک عەقاد، تەها حوسێن، محەممەد مەندور، هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ سیبەوەهی، بوختوری، کەسانی تر هەمووی هەر پێی دەگوترێت کەلەپوور٤.بەم پێناسەیە سەرجەم زانستەکان دەبن بەکەلەپوور، تەنها (وەحی) دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی جیاوازی بکرێت لە نێوان وەحی لەگەڵکەلەپوور٥.

زاراوەی کەلەپوور لە فیکری رۆژئاوا بە پاشماوەی شارستانیی، رۆشنبیریی وئایینیی دەگوترێت، رۆحی عەلمانیەت باڵادەستە بەسەر فیکری رۆژئاوا، بۆیە جیاوازی ناکەن لە نێوان پاشماوەی شارستانیی وئایین، لە هەڵسوکەوتیش جیاوازی ناکەن لەنێوان بەرهەمی مرۆڤایەتی و وەحی خوای گەورە، لای ئەوان هەمووشت شایستەی رەخنەگرتنە، ئایینیش ملکەچی ئەو مەنهەجە دەکەن، بەبێ هیچ پیرۆزیەک٦.

## بۆچوونی زانایان لەسەر کەلەپوور

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر گوتەوقسەی زانایانی پێشوو لەژمارە نایەت لەبارەی پیرۆزینەدان بەقسەی هیچ کەسێک جگە لە قورئان وفەرمایشتەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەم سۆنگەیەوە زانایانی پێشوو قسەو باسیان زۆربووە، ئێمە لێرە تەنها قسەی پێشەوایان: شافعی، ئەحمەد، مالیک و ئەبوحەنیفە دەهێنینەوە، کە هەریەک لەوانە چۆن روانیویانەتە قسەی کەسانی پێشخۆیان، ئێمە هەریەکەی یەک قسەیان وەک نموونە لێوەردەگرین.

ئەبوحەمزەی سوکری دەڵێت: گوێم لە ئیمام ئەبوحەنیفە بوو دەیگوت: ئەگەر فەرمایشتی پێغەمبەرمان بۆ هات بەسەندێکی راست وەریدەگرین، ئەگەر قسەی هاوەڵانی پێغەمبەر بوو، ئێمە سەرپشکین، ئەگەر قسەی تابعین بوو رەتیدەکەینەوە٧.

ئیمام مالیک وتویەتی: من مرۆڤم، راست دەکەم وهەڵە دەکەم، سەیری قسەکەم بکەن، ئەگەر هاوتا بوو لەگەڵ قورئان وسوننەت وەریبگرن، ئەگەر پێچەوانەی قورئان وسوننەت بوورەتیبکەنەوە٨.

ئیمام شافعی قسەیەکی بەناوبانگی هەیە، کە وتویەتی: ئەگەر قسەیەک راست بوو، ئەوە مەزهەبی منە. زانایانی تریش لەم بارەیەوە قسەیان زۆرکردووە، بەڵام ئێمە بەوەندە وازدێنین.

## کەلەپوور لای بیرمەندانی هاوچەرخ

بیرمەندانی ئیسلامیی بەدرێژایی مێژوو بێدەنگ نەبوون لەرەخنەگرتن لەو شتانەی کە دەنووسرێن، لە سەرجەم بوارکانی ئیسلام، بۆیەش ئەگەر بگەڕێینەوە ناو کەلەپووری ئیسلامیی،کەلەپوورێکی دەوڵەمەندمان هەیە، بەشێکی ئەو دەوڵەمەندییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەمیشە پانتاییەکی فراوان هەبووە بۆ رەخنەگرتن، بەڵام پێشتر هیچ سەرچاوەیەکی تایبەت نەبووە بە شێوازی ئەو رەخنەگرتنە، زیاتر شێوازەکان لەگەڵ خودی کتێبە رەخنەییەکان بووە، لەم رۆژگارەی ئێستاش ئەوانەی قسەیان لەسەر کەلەپوور کردوە زۆرن، بۆیە ئێمە چەند بیرمەندێکی دیار هەڵدەبژێرین:

### ١ـ تەهاعەبدورەحمان

دکتۆر تەها عەبدورەحمان دیاترین ئەوکەسانەیە قسەی لەسەر کەلەپوورکردوە، خاوەنی کتێبی تایبەتە لەوبوارە٩، لەچەندین دیمانەی تایبەتیش باسی لە کەلەپوور کردوە، ئەو خاوەنی میتۆدی

تایبەت بەخۆیەتی کە لە بیرمەندەکانی تری جیادەکاتەوە، ئەوەی ناوبراو جیادەکاتەوە، مەنهەجەکەیەتی، کە بریتییە لە مەنهەجێکی گشتگیر، یەکێکە لەو کەسانەی کە لە مەنهەجی جوزئی دوورکەوتووەتە، پێیوایە بۆ خوێندنەوەی کەلەپوور دەبێت دوورکەوینەوە لە بەشبەشکردنی کەلەپوور، کاتێک کەلەپوور دەخوێنینەوە دەبێت حیساب ئەو کات وشوێنە بکەین کە ئەو کەلەپوورەی تێدا لەدایکبووە، لەبارەی پێوەریش بۆ خوێندەوەی کەلەپوور، پێیوایە کە دەبێت مەرجەعەکەی بریتیبێت لە قورئان، چونکە قورئان سەنتەرە لە کەلەپووری ئیسلامی، سەرجەم زانستەکانی کەلەپوور لە خزمەت قورئان بوونە، بۆیە دەبێت بۆ خوێندەوەی کەلەپوور بگەڕێینەوە خزمەت قورئان، ناوبراو نەک بۆ کەلەپوور، تەنانەت بۆ رووبەڕووبونەوەی فکرە هاوردەکانی سەردەمی جیهانگیریش پێیوایە قورئان سەنتەرە، لەوبارەوە دەڵێت:پارێزەرێک نییە لەم سەردەمە لە لافاوی جیهانگیری جگە لە کەشتی وەحی نەبێت١٠.

ئەوەی بەلایەوە گرنگە، ئەو میتۆدەیە کە کەلەپووری پێ دەخوێندرێتەوە، بەلایەوە زۆرینەی ئەو تیۆرومیتۆدانەی کە رەخنەی لەکەلەپووری پێدەگیرێت، قبوڵکردنی بەشێک لە شتە سەلمێنراوەکانی گرانە، ئەگەر قبوڵیش بکرێت قبوڵکردنی ئەنجامەکەی قورسە، ئەگەر قبوڵی ئەنجامەکەشی بکەین قبوڵی جێبەجێکردنی تیۆرەکان قورسە، هۆکارەکەشی بۆ هەڵەی کوشندە دەگێڕێتەوە لە ناوەرۆکی ئەم تیۆرانە بەرامبەر بە کەلەپوور، هەروەها بەشێک لە بانگەشەکارانی ئەو میتۆدانە بەهۆی پەلەکردنەوە توشی حکومدانی بەپەلەبوون، لەگەڵ ئەوەی دەبوو ئەرکی یەکەمیان ناسینی حەقیقەتی ئەو میتۆدانە بوایە، سەبارەت بەهۆکارەکانیش پێیوایە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی توانای ئەو کەسانە، کە ئەو میکانزمە میتۆدیە عەقلانییەو ئیدۆلۆگیانە پەیڕەو دەکەن١١.

لە بارەی کەلەپوورەوە، داوا دەکات کە وازبهێنرێت لە بیرۆکەی خۆدارنینی گشتیی لە کەلەپوور، بەلایەوە شتەکان رێژەین، هەر لەسەر ئەم بنەمایە، ئەو بانگەشەیەی کە بیرمەندانی عەرەبی بۆ گەردونیەتی فیکری رۆژئاوا دەیکەن، ئەو رەتیدەکاتەوە، پێیوایە شارەزایی تەواویان نییە، ئەگەر باسی رەخنەگرتنیش بکرێت، پێیوایە توانای ئەوەیان نییە رەخنە لە فەلسەفەی رۆژئاوا بگرن، پێیانوایە هیچ جێدارێک نییە بۆ فیکرو فەلسەفەی رۆژئاوا.

ئەو بەهەموو شێوەیەک رێگرە لە پشتکردن لە کەلەپوور،کاتێککەلەپوور بریتییە لە چەندین رووداوی زانراو، هەر تەنها دەبێت نەک فرەیی، ئەگەر رێگاکانی گەیشتن بەو رووداوانە بە ئەندازەی ژمارەی بیرمەندابوایە، ئەوکات خۆیان پێ سەرقاڵ نەدەکرد١٢.

پێیوایە خۆسەرقاڵکردن بە کەلەپوور نابێت بەهۆی بارودۆخی رۆشنبیری وسیاسییەوە بێت، بەڵکو ئامانجی ئەو لە خوێندنەوەی کەلەپوور قسەکردنە لەسەرخودی کەلەپوور، لە پێناو لێکۆڵینەوەی بابەتییەبە پێی تێروانینی زانستی تەواو، نەک سەرقاڵبوون بە ئامانجی مۆدێرنەکردن وعەقڵانیکردن وریفۆرمکردن١٣.

## تەها عەبدوڕەحمان بۆ خوێندنەوەی کەلەپوور چوار رێسای داناوە:

یەکەم: بۆ خوێندەوەی کەلەپوور پشت بە لای کەمی دەقی کەلەپووری ببەسترێت، لەگەڵ رەچاوکردنی ناوەرۆکەکان، لەپێناو تێگەیشتن لە ناوەرۆک، هۆکارەکەی ئەوەیە کە کەلەپووری ئیسلامی بەشێکی زۆری بریتییە لەو میکانزمانە، بەتایبەت زمانەوانی و لۆجیکی.

دووەم: پێویستە گرنگی بە پێشهات (مستجدات)

**بەلای عەلوانیەوە یەکێك لە گرفتەکانی موسڵمانان دوورکەوتنەوەیە لە قورئان، لەبری گەرانەوە بۆ قورئان دەگەڕێنەوە بۆ کەلەپوور.**

بدەین لە میتۆدەکان، نەک میکانزمەکانی کەلەپوور، یاخود شاردنەوەی، ئەمەش لەپێناو دەرخستن ونوێکردنەوەی رەخنەیە، هەروەک تەنها دارِنینی میکانزمەکان لە کەلەپوور بەس نین، بەبێ زیادکردنی پێشهاتی میتۆدی، چونکە ئەو دارِنینە هیچ شتێک زیاد ناکات.

سێیەم: ئەو میکانزم ومیتۆدە دەرەکیانەی کە بۆ خوێنەوەی کەلەپوور وەردەگیرێن، بەر لەوەی کەلەپووری ئیسلامیان پێ بخوێندرێتەوە، پێویستە بخرێنە ژێر رەخنە، بۆ ئەوەی روون بێتەوە، کە تاچەند گونجاوە، بۆ نموونە ئایا میکانیزمی عەقلانیەتی رۆژئاوایی چەند گونجاوە بۆ خوێندەوەی کەلەپووری ئیسلامی؟لە دیدی ئەودا ئەو چەمکە گونجاو نییە بۆ خوێندەوەی کەلەپووری ئێمە، چونکە عەقلانیەتی رۆژئاوایی لەسەر بنەمای داماڵینی تیۆری بنیاتنراوە، عەقلانیەت لە کەلەپووری ئێمە لەسەر ئاراستەکردن بەرەوچاکردن بنیاتنراوە.

چوارەم: پێویستە لە بێژنگدان یان ئاوێتەکردن یەک ئاراستە نەگرن، لە بێژنگدان یان ئاوێتەکردن نابێت بە گوێرەی میکانزمی رۆژئاوایی بێت، بەڵکو دەبێت بە پێچەوانەوە بێت، لەبێژنگدان وئاوێتەکردنەکە بەهۆی میکانزمی ئیسلامیی بێت، بەهۆی ئەوەوە رێگای داهێنان لە بیرمەندی ئیسلامیی دەکرێتەوە.

ئەوانەی باسکران کۆڵەکەی رێساکانە لای تەها عەبدورەحمان، ناوبراو پەیرەوی لێکردون نەک تەنها بۆخوێندنەوەی کەلەپوور، بەڵکو بۆ هەموو هەوڵەبەردەوامەکانی لە دەستپێکردنی پێشکەکردنی مەعریفەی ئیسلامیی١٤.

کتێبی(تجديد المنهج في تقويم التراث) بە دیارترین سەرچاوەی هاوچەرخ دادەنرێت، لە نوێکردنەوەی مەنهەج، ئەو کتێبە یەکێکە لەو کتێبانەی رەخنە لە پرۆژەکەی (محەممەد عابد ئەلجابری)دەگرێت، پێیوایە جابری بۆ رەخنەگرتن لە کەلەپوور پشتی بە عەقلانیەت بەستووە، لەگەڵ دابران لە کەلەپوور، جابری بانگەشەی نزیکی کەلەپوور دەکات لە رووی بابەتیی ومێژوویی لە عەقلانیەتی رۆژئاوا، لەگەڵ داواکردنی چەسپاندنی دابران لەگەڵکەلەپوور بۆ چاسەرکردنی بابەتیانەی ئەو کێشەیە، دروستکردنی رێگای بەردەوامی، یان دەستپێکردن، پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئایا جابری بەکردەیی ئەو دابرانەی کردووە لە تێگەیشتنی بۆ کەلەپوور؟ خۆ ئەگەر هەڵوێستی ئیجابی بێت لە کەلەپوور،ئەوە دەخوازێت کە رەتکردنەوەی کەلەپوور هەولوێستێکی نازانستیی، نامێژوویی بێت١٥.

### ٢- تەها جابر ئەلعەلوانی

هەرکات باس لە کەلەپووور بکرێت، بێ باسکردنی دیدو تێروانینەکانی عەلوانی وەک ئەوەیە باسی هیچ شتێک نەکرابێت، عەلوانی بەیەکێک لە کەسە هەر دیارەکان دادەنرێت لە قسەکردن لەسەر کەلەپووری ئیسلامیی، لەگەڵ ئەوەی عەلوانی زانایەکی بەهێزی بواری ئوسوڵی فیقهە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بۆ بۆچونەکانی پشتی بەقورئان دەبەستێت، عەلوانی یەکێکە لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی (اسلامية المعرفة)، توانیویەتی لەرێگای ئەم قوتابخانەیە

کاری باش بکات بۆ خوێندنەوەی کەلەپوور، لێرەدا هەوڵدەدەین چەند تیشکێک بخەینە سەر دیدو تێروانینەکانی عەلوانی.

بەر لە هەمووشت لای علوانی قورئانی پیرۆز سەنتەرە بۆ هەموو پرسەکان، بۆیەجەخت لەسەر گەڕانەوە بۆ قورئان دەکات بۆ پرسەکانی ڕۆژگار، ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە قورئان لای عەلوانی لەدەرەوەی بازنەی کات وشوێنە، لەم بارەوەش قسەی خۆی هەیە لە چەندین شوێن ئاماژەی پێداوە، ئەو پێیوایە بانگەشەکارانی (تأريخية القران) نەیانتوانیوە بڕوا بەوە بکەن، کە قورئان کەلامی خوای گەورەیە، بۆیە بە ناچاری پەنایان بۆ شتێک بردووە، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەوان جیاوازیان نەکردوە، لە نێوان زمانی قورئان وزمانی زمانی عەرەبی، ئایەتی قورئان وقەسیدەیەکی ئیمرولقەیس نەکردوە، بۆیە بەناچاری پەنایان بۆ ئەوە بردووە کە خیتابی قورئان تایبەتە بەو کەسانەی لەو سەردەم بوونە، ئەوانەی لە دوای پێغەمبەرەوە هاتوون ئەم خیتابانە نایانگرێتەوە، لەمەدا موسڵمانان کەوتونەتە هەڵە، چونکە ئەوان ئەوە لە هێرمۆنیتیکا فێربوون دەبێت زەینی نووسەر بخوێندرێتەوە، کاتی گوتارەکەی، شوێنەکەی، ڕۆشنبیری ودەوروبەرەکەی، بۆیەش ئەرگۆن و شەحرور و تەیب تەیزینی لەبری بڕواهێنان بە وەحیبوونی قورئان، بڕوایان بە مێژوویەتیی قورئان هێناوە١٦.

## کەلەپوور و وەڵامی پرسەکانی سەردەم

بەلای عەلوانیەوە یەکێک لە گرفتەکانی موسڵمانان دوورکەوتنەوەیە لە قورئان، لەبری گەڕانەوە بۆ قورئان دەگەڕێنەوە بۆ کەلەپوور، ئەوەش مێژوویەکی درێژی هەیە لەوکاتەوە دەستپێکردووە کە عەبدولعەزیز باوکی خەلیفە عومەر لە ساڵی ٨٣ کۆچی بیریکردەوە، کە فەرمودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کۆبکاتەوە بۆ چارەسەکردنی ناکۆکیە فیقهیەکان لەبری ئەو فیقهە ناکۆکەی کە زانایان دایانهێنابوو، بۆیە زانایان خۆیان سەرقاڵ کرد بەسوننەکان و دوورکەوتنەوە لە قورئان بەبیانوی ئەوەی ئەوەی لەسوننەت هاتووە لەقورئانیش هاتووە، سوونەتیان دەکردە بەڵگە لەسەر فەتوای زانایانیان، دواتر وازیان لەوەش هێنا، فیقهیان کرد بەهەموو دین، تەنانەت کەسێکی وەک (کەرخی حەنەفی) دەڵێت: هەمو ئەو ئایەتانەی پێچەوانەی ئەوەن کە هاوەڵانمان پەیڕەوی دەکەن، یان نەسخ کراونەتەوە، یان دەبێت تەئویل بکرێن، چونکە بەم جۆرەی ئێستا دەبێت فەرع شوێن ئەسڵ بکەوێت١٧.

ئەم گۆڕانکارییە کاریگەری گەورەی بەجێهێشتووە لەسەر موسڵمانان، ئەو بۆ ئەمە بە پێویستی دەزانێت موسڵمانان بگەڕێنەوە بۆ قورئان، چونکە فیقهی کۆن چاسەری کێشەکانی ئەمڕۆی پێنییە، نموونەش بەوە دێنێتەوە کە کاتێک لە ئەمریکابووە ڕۆژانە حەوت تا دەپرسیاری ئاڕاستە دەکرا، ٩٥٪ پرسیارەکان تازە بوون، زانایانی پێشوو باسیان نەکردبوو، دەگەڕایەوە بۆ کتێبە درێژەکانی وەک: (المغني إبن القدامة، محلي إبن حزم، المسبوط السرخسي، الام للشافعي)، وەڵامێکی تێدا نەبوو بۆ ئەو پرسیارانە، دەبوو وەڵامێکی لە کەلەپوور بۆ بێنێت کە بۆ ئەو پرسیارانە نەدەبوو، ئەم حاڵەتە وا لە موسڵمان دەکات توشی بێهیوای بێت، کە ناتوانێت ڕووبەڕووی واقیعی خۆی ببێتەوە، بۆیە پێیوایە دەبێت فیقهێکی تازە بەرهەم بێت کە وەڵامی پرسیارەکانی ئێستامان بداتەوە١٨.بۆ مامەڵەکردنیشلەگەڵکەلەپووردەبێت سێ ئاست تێپەڕێنین:

**محەممەد عەممارە پێیوایە زانایانی ئیسلامیی لە هەموو بوارە جۆراوجۆرەکان گرنگی زۆریان بە وەرگرتن و ڕەتکردنەوەی مەعریفەی مرۆڤەکان داوە.**

ئاستی یەکەم: نابێت کەلەپوور بەگشتیی ڕەتبکرێتەوە، وەک عەلمانیەکان دەیکەن.

ئاستی دووەم: نابێت بە گشتیی وەربگیرێت وەک کەلەپووریەکان دەیکەن.

ئاستی سێیەم: نابێت خوێندەوەمان بۆ کەلەپوور هەڕەمەکی بێت بە بێ بوونی میتۆدێکی زانستی١٩.

عەلوانی لە نووسینەکانی وەڵامی زۆرشت دەداتەوە، نموونەیەک لە واقیعی موسڵمانان باس دەکات و دەڵێت:لە ئەزهەر لیژنەیەک هەبوو پێی دەگوترا (تاقیکردنەوەی دیاریکردن) کتێبێکیان دەهێنا لاپەڕەیەکی بۆ خوێندکارەکە دەکردەوە، پێیان دەوت: بخوێنەوە و شیبکەرەوە، لەبەرامبەر ئەم لیژنەیە لایەنی بەلاغی و لۆژیکی وزانستەکانی تری شیدەکردەوە، بەڵگەی دەهێنایەوە ڕەتی بەڵگەی تری دەکردەوە، بەم جۆرە قوتابی تاقی دەکرایەوە، ئەوەی دەیوت هیچی تازە نەبوو، بەڵکو هەمووی شتی کەلەپووری بوون، ئەگەر واز لە ڕەخنە بێنین ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نەزانی ودواکەوتوویمان، ئەگەر هەموومان هەڵسین بەم کارە، کارەکە پێچەوانە دەبێتەوە٢٠.

لایەنێکی تر کە عەلوانی سەرسەختانە داکۆکی لێ دەکات، بریتییە لە زانستەکۆمەڵاتییەکان، وەک پێداویستی هاوچەرخ، ئەمە جگە لەوەی وەڵامی ئەو ڕەخنانە دەداتەوە، کە ڕەخنە لە موسڵمانان دەگرن، کە داهێنانی فیکری وفەلسەفیان نییە، تەنها سەرقاڵی گێرانەوە بوون، ئەو بەتوندی ئەو بۆچونە ڕەتدەکاتەوە، کە موسڵمانان لە پاش گەلانی تر بووبن، ئەوبۆچوونە ڕەتدەکاتەوە، پێیوایە کەلەپووری ئیسلامیی بەگوێرەی زەمەنەکان بووە، بۆ ئەمەش دەڵێت: زانستی کەلام و فەلسەفە دوو نمونەی زیندون، هەروەها باس لەوە دەکات کە لە کەلەپووری ئیسلامییدابنەما دانراوە بۆ مامەڵەلەگەڵ زاستە مرۆڤایەتییەکان.

یەکەم: زانستەکۆمەڵایەتیی و مرۆییەکان لە کەلەپووری ئیسلامی بنەمای بۆ دانراوە.

### ٣- محەممەد عەممارە

یەکێکە لەو بیرمەندە دیارانەی کە قسەی خۆی لەسەر کەلەپوور هەیە، عەممارە جگە لەوەی خاوەنی دیدوتێڕوانینی خۆیەتی لەسەر کەلەپوور، ڕۆڵی گەورەی بینیوە لە کۆکردنەوەی کەلەپووری بیرمەندانی وەک جەمالەدینی ئەفغانی،محەممەد عەبدە، عەبدوڕەحمان کەواکیبی وچەندان بیرمەندی تر، هەروەک چەندین نووسراوی زانایانی پێشوی تەحقیق کردووە، عەممارە بەیەکێک لە بیرمەندە دیارەکان دادەنرێت کە خاوەنی دیدو تێروانی خۆیەتی، هەوڵ دەدەین بەشێک لە دیدەکانی سەبارەت بە کەلەپووری ئیسلامیی بخەینەڕوو.عەممارە چەندکتێبێکی تایبەت بە کەلەپوور نووسیوە، لەوانە: (التراثوالمستقبل) و(نظرةجديدةإلياالتراث)

### دابەشکردنی کەلەپوور بۆ چەند ئاستێك

محەممەد عەممارە کەلەپوور دابەشدەکات بۆ: کەلەپووری ئایینی، کەلەپووری ئیسلامیی، کەلەپووری فیکریی، زانستیی، ڕۆشنبیریی و شارستانیی.پێیوایە ئەمانە یەک ئاستیان نییە، بەڵکو چەند ئاستێکی جیاوازن.

بۆ نموونە قورئان پیرۆز (مقدس)ە سەرچاوەی یەکەمە، لەگەڵ ئەوەشدا دابەشبووە بۆ چەند ئاستێکی جیاواز، بۆ نموونە لەقورئان چەند ئاستێکی جیاواز هەیە: موحکەم (قطعي الثبوت) کە ئەوانە جیاوازی هەڵناگرێت لە تێگەیشتن و راڤەکردن، بەهەمان شێوە سوننەت هەندێکی متەواترە ـ قطعي الثبوت سوننەت چەند ئاستێکی تری هەیە، لەوانە روونکردنەوەی ئایاتی قورئان، یان بە واتایەکی تر جێبەجێکردنی ئایەتی قورئان٢١.

دوای ئەمانە کەلەپووری گەلان دێت ئەوەی مرۆڤەکان دایانهێناوە لە بوارە جۆراوجۆرەکان، ئەمانە پیرۆز نین، پارێزراویش نین لە هەڵەو کەموکورِی، بەڵام سەرمایەیەکی معریفی بەهێزن، مرۆڤ دەتوانێت سودمەندبێت لێیان٢٢.

ئەگەرچی بەشێک لە بیرمەندان ونووسەرانی هاوچەرخ پێیانوایە پرۆسەی خوێندەوەی رەخنەییانە بۆ کەلەپوور شتێکی تازەیە، لە پێشودا کەلەپوور وەک پیرۆز سەیرکراوە، بەڵام محەممەد عەممارە ئەم بۆچونە رەتدەکاتەوە پێیوایە هەر لەسەرەتاوە زانایانی ئیسلامیی لە هەموو بوارە جۆراوجۆرەکان گرنگی زۆریان بە وەرگرتنو رەتکردنەوەی مەعریفەی مرۆڤەکان داوە، تەنانەت لە وەرگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەریش وردەکاری زۆرکراوە، ئنجا وەرگیراوە، کەسێکی وەک ئیمام بوخاری دوای کۆکردنەوەی هەزاران فەرمودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئنجا سەحیحەکەی دادەنێت،لەگەڵ دانانی چەندین یاساو رێسای بەهێز لەپێناو دورکەوتنەوە لەهەڵە٢٣. ئەگەر سەیری کتێبەکانی تر بکەین لە بوارەکانی عەقیدە، شەرع، ئوسوڵ و تەسەوف٢٤، بەهەمان شێوە چەندین وردەکاری تێداکراوە.

خاڵێک کە بەلایەوە زۆر مەترسیدارە و قسەکردنی زۆر هەڵدەگرێت، ئەویش مێژووی موسڵمانانە، چونکە مێژوونوسان هەموو بیستراوێکیان نووسیوەتەوە،بێ وردەکاریکردن، هەروەها دەڵێت باشترین بەڵگە ئەوەیە کە ناونراوە بە(ئاژاوە گەورەکە)٢٥.

لەگەڵ ئەوەی کەلەپووری ئیسلامیی کاری زۆری بۆ کراوە، بەڵام هێشتا نەبووە بە کارێکی گرنگ، ئەمە جگە لەوەی بەشێکی زۆری کەلەپووری ئیسلامیی داگیرکراوە، زۆرێک لە دەستنووسەکانمان لە کتێبخانەکانی وڵاتی دەرەوەن، کە بەهۆی بەهێزی ئەوان ولاوازی ئێمە لە کتێبخانەو مزگەوت کەنیسەکانمان بردوویانە٢٦.

بۆ خوێندەوەی کەلەپوور پێویستمان بە پلانێکی توکمە هەیە، تا بە میتۆدێکی زانستی کەلەپووری ئیسلامیی بخوێنینەوە، ئەو دەقانەی ساغ نەکراونەتەوە ساغیان بکەینەوە٢٧. عەممارە پشتی بەستووە بە نووسراوێکی شێخ محەممەد عەبدە، کە پێشنیاری کردوە بۆ ئەزهەر چۆن مامەڵەلەگەڵکەلەپوور بکەن، لە و نووسراوەدا دەڵێت: پێویستە قورئانی پیرۆزو فەرمودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)بە وردی بخوێندرێنەوە، بەگوێرەی بنەماکانی زمانی عەرەبی و رێسا زانستییە دروستەکان.هەروەها بیروباوەرِی ئیسلامیی پاکبکرێتەوە لە دابونەریت لەگەڵ بنەما دروستەکانی ئیسلامرێکبخرێتەوە.پێویستە جارێکی تر فیقهی ئیسلامیی دابرِێژرێتەوە و دوور بخرێتەوە لە هەموو دەمارگیرییەکی مەزهەبی، ئەم خوێندەوەیە دوور بێت لە زیانگەیاندن بەوحوکمانەی کە دەقی قورئانی لەسەر هاتووە٢٨.

وێنەکاری هونەری ڕۆشنبیریە.

## سەرچاوە و پەراوێز:


١ لە عەرەبیدا وشەی (تراث) زیاتر مەبەست پێی نووسراوی زانایانی پێشووە لەسەر بابەتە ئایینییەکان، لەم نووسینەشدا چەمکی کەلەپوور بەو مانایە بەکارهاتووە.

٢ دیارە قسەکردن لەسەر بابەتێکی لەمجۆرە لە کورتە بابەتێک تەواو نابێت، پێویستییە لێکۆڵینەوە درێژهەیە، چونکە هەر لەوانەی قسەمان لەسەرکردوون پێویستیان بە نامەی ماستەر و دکتۆراهەیە.

٣ حوارات من أجل المستقبل شبكة العربية للأبحاث والنشر ٢٠١١/ ل١٦.

٤ مناهج تحقيق التراث د. رمضان عبدالتواب/ الناشر المكتبة النخاجي١٩٨٥ ل ٨.

٥ بڕوانە: نظرية التراث. فهمى جدعان/ دار الشروق للتوزيع والنشر ١٩٨٥.ل ١٩، إزالة الشبهات عن معانى المصطلحات ٢٠١٠/ د.محمد عمارة. دارالسلام ل ٢٦٧.

٦ التراث والمعاصرة أكرم ضياء العمري سلسة كتاب الأمة ١٤٠٥ هجري/ ل ٢٩.

٧ إذا صح الحديث فهو مذهبي تأليف: الدكتور نايف على بقاعي/ دارالبشائر الإسلامية. ل ٩٠.

٨ سەرچاوەی پێشوو ٩٢.

٩ تجديد المنهج والتقويم التراث/ ناشر المركز الثقافي ٢٠٠٥چاپی دووەم.

١٠ روح الحداثة/ ناشر المركز الثقافي /٢٠٠٦ ل ٨١.

١١ حوارات من أجل المستقبل ل ١٧.

١٢ حواراتمنأجلالمستقبل.

١٣ حوارات من أجل المستقبل ل٢٢.

١٤ حوارات من أجل المستقبل ل ٢٠و٢١.

١٥ إبراهيم مشروح، طه عبدالرحمن، قراءة في مشروعه الفكري/ مركز الحضارة لتنمية الفكر الإسلام ٢٠٠٩ ل١٥٢.

١٦ بڕوانە: دعوى تاريخانية القرآن د. طه جابر العلوانى موقع الزهاوي.

١٧ الجمع بين القراتين د.طه جابر العلواني/ دارالسلام ٢٠١٤ل ١١.

١٨ تطور المنهج المقاصدي عند المعاصرين مدارسة مع الشيخ طه جابر العلوانى حوار زينب العلواني، المعهد العالمي للفكر الإسلامي ٢٠١٢ ل ٢٢.

١٩ مقدمة في إسلامية المعرفة د. طه جابر العلوانى دار الهادي ٢٠٠٩ ل ١٣٤.

٢٠ سەرچاوەیپیشوو. ل ١٤٥.

٢١ إزالة الشبهات عن معاني المصطلحات/ د.محمد عمارة دارالسلام ل ٢١٥.

٢٢ سەرچاوەی پێشوو.

٢٣ سەرچاوەی پێشوو،ل ٢٦٩.

٢٤ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٢.

٢٥ سەرچاوەی پیشوو، ل ٢٧٥.

٢٦ التراث والمستقبل. محمد عمارة دارالسلام / ل٢٥.

٢٧ سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

٢٨ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٢.

# زمان

## زیاتر لە ئامرازێکی گفتوگۆ

### دیوێکی تری مەدالیا زێڕینەکەی کەلەپووری ئیسلامیی


**موئمین زەڵمی**

- ماستەر لە زمان و ئەدەبی ئینگلیزی.
- کاندیدی دکتۆرا لە سیاسەتی زمان و پەروەردە.
- چەند وتار و لێکۆڵینەوەی بڵاوکراوەی هەیە.

## کورتە

ئەم توێژینەوەیە، وەستانە لەسەر (زمان) وەک یەکێکە لە ژانرەکانی کەلەپووری ئیسلامیی، لە سەرەتادا لەسەر کەلەپووری ئیسلامیی و بەشە گرنگەکانی دەوەستێت و دواتر پێناسە و ڕوانینەکانی سەر (زمان) شیدەکەرێتەوە، هەروەک چاوێک دەخاتە پێکەوەبەستنی زمان و کەلەپووری ئیسلامیی و لە کۆتاییشدا پەرسەندنەکانی زمان و کەلەپوور دەخاتەڕوو.

## پێشەکیی

ئیسلام وەک دوایین ئایینی باڵا و درەوشاوەی مرۆڤایەتی، ئایینێکی گشتگیر و هەمەلایەن و تەواو و تۆکمەیە، دیاریشە لە سەر بناغەی گەشە و وەرگرتنی فۆرمی فراوانبوونی هەر ئایینێکدا، زمان ڕۆڵێکی باڵای هەبووە، ئەگەر سەرنجێکی سەرەتای هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەری (درودی خوای لەسەر بێت) بدەین، دەبینین هێزی زمان دەدرەوشێتەوە، کاتێک هەموو قورئانی پیرۆز بە بەرزترین ئاستی زمانەوانی دادەبەزێت، لەو کاتەوەش ئیتر زمانی عەرەبی بۆ خۆی فۆرمی ستانداردی وەرگرتووە و تەواوی دانیشتوانی عەرەبیزمانی سەرزەوی زمانی قورئانیان بە ستاندارد زانیوە، چونکە هەموو مەرجەکانی زمانی باڵای تیادا دەبینرێن. ئێمە لەم توێژینەوەیەدا لە سەر فۆرمی گشتیی و بەهێزیی زمان لە کەلەپووری ئیسلامیی و شارستانێتی ئیسلامیدا دەوەستین، جا زمانیش، بە هەموو خێزانەکانییەوە، نەک تەنها زمانی عەرەبی. بەڵکو زمانی موسڵمانان بە گشتیی کە دەبنە ناسنامە و پێناسی ئاییندارییان.

گودەرزی (٢٠١٠) پێیوایە، زمان ئاوێنەی ڕۆشنبیری کۆمەڵگەیە، و ئەو ئامرازەشە کە خزمەتی گەلان دەکات بۆ دەربڕینی ڕەگەزە جیاوازەکانی ڕۆشنبیرییان: عادەت و تەقالید و یاسا و ڕێساکانیان. بۆیەش پەیوەندییەکی تەواوەتی هەیە لە نێوان زمان و ڕۆشنبیریدا، هەردووکیشیان پێکەوە دەبنە کەلەپووری گەل و ئایین و نەتەوەکان.

هەروەک زمان دەچێتە چوارچێوەی کەلەپووری کۆمەڵگە و نەتەوە و ئایینەکانەوە، بۆیە پارێزگاریکردنی زمانی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگانە لە پێشینەی ئەرکە کەلتوورییەکاندایە، زمانە جیاوازەکان هەموو فۆرمەکانی چیرۆک، شیعر، گۆرانی و فەرموودەکان ڕێکدەخەن، بۆیەش مەرگی هەر زمانێک بە واتای مەرگی ئەو نەتەوە و کۆمەڵگانە دێت،

## کەلەپووری ئیسلامیی

کەلەپووری ئیسلامیی، کۆنسێپتێکی فراوانی گشتگیرە کە پەیوەستەکان بە ئیسلامەوە دەگرێتەوە، کە بریتین لە: قورئان و فەرمودەکان، ئیجتیهادی زانایان، سامانی ئیسلامیی. هەروەک لە پێناسەی گشتیی کەلەپوورەوە، دەتوانین کەلەپووری ئیسلامیی وا پێناسە بکەین کە لە سادەترین پێناسەیدا کۆگای هەموو چالاکییەکانی تاک و کۆمەڵگەی موسڵمانان دەگرێتەوە کە لە زەمەنێکی دیاریکراودا ئەنجامیان داوە، ئەو کۆگایەش بە پێی قۆناغە مێژووییەکانی ئیسلام گۆڕانی بەسەرداهاتووە، بەڵام دەتوانین بە شێوەیەکی گشتیی چالاکییە ئیسلامییەکان بەسەر، شیعر و نووسین، تابلۆی هونەری، بەڵگەنامەی مێژوویی، پارچەی هونەری، گۆرانی و موناجات، شێوەیەکی بیناسازی، تەقالیدی خێزانیی، مادەی فۆلکلۆری، ڕازی ئەفسانەیی، پەندی میللی، عورفی کۆمەڵایەتیی ... تاد دابەشبکەین، بە کورتی، کەلەپوور کۆگای گەشەیەکی مێژوویی کۆنە کە لایەنەکانی ڕۆشنبیریی، ئەدەبیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، شارستانیی ... تاد دەگرێتەوە.

## ژانرەكانی كەلەپووری ئیسلامیی

بە سەرنجدان لەسەر كەلەپووری ئیسلامیی و شارستانێتی ئیسلامیی، دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامەی كە كەلەپووری ئیسلامیی دابەشدەبێت بەسەر دوو كاتیگۆری سەرەكیدا: بەڵگەنامە و شاكارە پارێزراوەكان لە مۆزەخانە و كتێبخانە جیهانییەكاندا. هەروەها؛ هونەری پیرۆز، عادات و ترادسیۆنەكانی موسڵمانان كە تا ئێستاش كەریگەری گەورەیان ماوەتەوە لەسەر موسڵمانان و خەڵكانی تریش.

## زمان؛ پێناسە و پەرەسەندنەكان

بە گوێرەی باوترین پێناسەكان، زمان سیستەمێكی ڕێكخراوی دەنگیی و هێماییە كە بە شێوەی نووسراو یان گوفتار لە لایەن مرۆڤ لە چوارچێوەی خێزان، گرۆی كۆمەڵایەتیی یان كەلتووریەوە بەكارهێنراوە بۆ پەیوەندیبەستن و گواستنەوەی بیروبۆچوون، لە چوارچێوەی لێكۆڵینەوەی بواری زمانیشدا، (زانستی زمانەوانی) بە یەكێك لە زانستە فراوانەكان ناسراوە.

زمان بە گوێرەی گرۆكان، بەسەر خێزانەكاندا دابەشكراوە كە ئەو كۆزمانانەی دەكەونە چوارچێوەی خێزانێكەوە نزیكی و تێگەشتن و گواستنەوەیان لە یەكترەوە نزیكتر و ئاسانترە. ئامانجی سەرەكی بەكارهێنانی زمان بۆ سەركەوتنی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و گرۆكانە. بۆیەش هەر سیستەمێكی گواستنەوەی تایبەت بە تاكێك دەبێتە زمانی ئەو تاكە.

بەكارهێنانی زمانەكان لە سەرزەویدا بەسەر كۆمەڵێك زمانی جیاوازدا دابەشبوون، بە گوێرەی لێكۆڵینەوەیەكی ڕۆژنامەی واشتنتۆن پۆستی ئەمریكی، لە ئێستادا بە لایەنی كەمەوە ٧،١٠٢ زمان بەكاردەهێنرێن، كە زمانی (چینی) بە فراوانترین زمان دادەنرێت و لە لایەن نزیكەی ١.٥ ملیار تاكی سەرزەوییەوە بەكاردەهێنرێت، زمانی ئینگلیزی كە بە بەهێزترین زمانی سەرزەوی ناسراوە، یان هەندێ جار بە (زمانە بكوژەكە) ناسراوە، لە ئێستادا سەدان ملیۆن كەس لەسەر زەویدا بەكاریدەهێنن و ئەم ژمارەیەش لە سایەی (جیهانگەرایی – گلۆبالیزەیشن)دا بەردەوام لە زیادبووندایە، هەروەك خاڵی سەرنجراكێش ئەوەیە كە بە پێی مۆدێلی سێ بازنەیی كاچروو (١٩٨٢) ئێستا تەنها ٢٥٪ بەكارهێنەرانی زمانی ئینگلیزی لەسەر زەویدا كەسانی ئینگلیزن، بەڵام ٧٥٪ بەكارهێنەرانی زمانی ئینگلیزی، ئەم زمانە وەك زمانی دووەم، یان زمانی بیانی بەكاردەهێنن، بۆیەش چیتر ئینگلیزی تەنها زمانی ئینگلیزەكان نییە، وەك چۆن عەرەبییش ئێستا تەنها زمانی عەرەبەكان نییە، بەڵكو زمانی هەموو موسڵمانانی جیهانە.

زمانی عەرەبیش كە زمانی دایكیی پێغەمبەر محەممەدە (درودی خوای لەسەر بێت)، و زمانی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆزە، بە یەكێك لە زمانە فراوانەكان دادەنرێت، زمانی عەرەبی ئەگەر لە پێشتردا زمانی تەنها عەرەبەكان بووبێت، ئەوا لەگەڵ هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا بووەتە زمانێكی پڕبایەخی تەواوی موسڵمانانی جیهان، بە گوێرەی ئامارێكی ساڵی ٢٠١٠ نزیكەی ٥٠٠ ملیۆن كەس لەسەر زەویدا زمانی عەرەبی وەك زمانی یەكەم بەكاردەهێنن و لە ٢٥ وڵاتی جیهانی عەرەبیدا زمانی عەرەبی بەكاردەهێنرێت.

هەروەك بە گوێرەی سەرچاوە مێژووییەكانی زمان، زمانی عەرەبی كاریگەری ڕاستەوخۆی هەبووە لەسەر زمانەكانی تر، بە تایبەتیش فارسی، توركی، كوردی، ئوردو و كە زمانی بەشێكی فراوانتری موسڵمانانە لە جیهاندا، لێرەشەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەكی كە بوونی هەردوو پایەی قورئان و فەرمودەكانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر

**پێویستە چالاکییەکانی زمانی کوردی وەك یەکێکە لە بەشە گرنگەکانی کەلەپووری ئیسلامیی گەشەی زیاتریان پێبدرێت.**

بێت) بە زمانی عەرەبی، هێزی زیاتریان داوەتە ئەم زمانە و ڕۆژ بە ڕۆژیش بەکارهێنەرانی زمانی عەرەبی کە موسڵمانانن لە زیادبووندان. هەروەک بە گوێرەی پێناسەکەی سەیدلهۆفەر(٢٠٠٥) بۆ لینگوافرانکا، ئێستا زمانی عەرەبی بە یەکێک لە زمانەکان دادەنرێت وەک زمانی لینگوافرانکا بەکار دەهێنرێت، چونکە ژمارەیەک نەتەوە و وڵاتی جیاواز بۆ پەیوەندیکردن بەکاریدەهێنن.

### زمان و کەلەپووری ئیسلامیی

پاش ئەوەی لە دوو سەکشنی جیاوازدا لەسەر کەلەپووری ئیسلامیی و زمان وەستاین، ئێستا دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە زمان یەکێکە لە پایەکانی کەلەپووری ئیسلامیی، چونکە هەموو بەڵگەنامە، شاکارە هونەرییەکان، نووسراوەکان، هەڵکۆڵینەکان، زەخرەفەکان، شیعر و پەخشان و زانستەکان، زمان بناغەی دەربڕین و فراوانبوون و گەشەکردنیانە، بۆیەش وەک پێشتر ئاماژەی پێدرا، ئامانجی ئەم توێژینەوەیە، خستنەڕووی هێزی زمانە وەک بەشێکی جیاواز، فراوان و بەهێزی کەلەپووری ئیسلامیی.

موسڵمانان، گرنگی زۆر بە زمانەکەیان دەدەن، بە کۆی زمانەکە و زاراوەکانی، بۆیە ئەم گرنگیپێدانە بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی زانستی زمانەوانی لە ڕێزمان و بەشەکانی زماندا، هەروەک زمان زانستێکی ئایینییە.

زمان کۆگای فیکریی، ڕۆشنبیریی، دیوانی شارستانی و کەلەپوورە، بۆیە لەگەڵ قووڵبوونەوەمان لەسەر کەلەپووری ئیسلامیی، دەتوانین هەموو ئەو زمانانەی لە خزمەت گەشە و فراوانی و مانەوە و بەردەوامی پەیامی ئیسلامیدا هەن بە کەلەپووری ئیسلامیی و سامانی شارستانێتی ئیسلامیی بناسێنین، جگە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر، شیعرەکان، بەڵگەنامەکان، پرۆژە سیاسیی و سەربازیی، ئابوریی، کۆمەڵایەتیی، هونەر و کەلتوورییەکان کە هەریەکەیان بە زمانێک نووسراونەتەوە دەبنە سامانی کەلەپووری ئیسلامیی، بۆ نموونە: جگە لە زمانی عەرەبی، نووسین و شیعر و شاکارە هونەرییە فارسییەکانی سەر مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکان، یان شیعر و چیرۆک و نووسینە سۆفیزمییەکانی مەولانای ڕۆمی بە فارسی و دواتریش تورکی، شاکارە بەرزەکانی مەحوی و نالی و مەولەوی بە زمانی کوردی هەموویان دەچنە چوارچێوەی کەلەپووری ئیسلامییەوە.

### هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە

وەک ئاماژەمان پێکرد، زمان دەبێتە یەکێک لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی کەلەپووری ئیسلامیی و سامانی شارستانێتی ئیسلامیی، هەروەک ئەگەر سەرنج بدەین، تاکی موسڵمان دەبێت شانازی بکات بەوەی کە زمانەکەی بەشێکە لە کەلەپوورەکەی، چونکە ئەگەر نموونەیەک وەربگرین نوێژ و هەموو عیباداتەکان پەیوەندیگرتنە لەگەڵ خالق و و لەگەڵ گرۆی موسڵماناندا، زمانیش تاکە ئامرازی پەیوەندییەکانە، بۆیەش وەک چۆن هونەر و شاکارە ئیسلامییەکان لە ڕێگای زمانەوە دەخرێنەڕوو، ئاواش عیبادات و پەرەستشەکان بە زمان سەردەگرن. زمانی عەرەبی لە سەردەمی پەیامبەرایەتی و خەلافەت و دواتریش قۆناغەکانی

میژووی ئیسلامییدا نه تەنها زمانی عیبادات و پەرەستش بووە، بەڵکو زمانی هونەر و شاکاری هونەری و زەخرەفە و هەڵکۆڵین بووە، ئاواش زمانی سیاسەت و ئابووری و زانست و کۆمەڵایەتیی بووە. بۆیەش ناکرێت زمان لە کەلەپووری ئیسلامیی جیابکەینەوە، یان وەک دەوترێت زمان هەموو شتێکە، بەڵام زۆرجار ئەم هەموو شتبوونە کەمهێنانی بۆ رۆڵی زمان لێکەوتۆتەوە.

فەیلەسوفی ئەڵمانی فیختە (١٧٦٢- ١٨١٤)، زمان بە گوفتار و هەڵویستی نەتەوە ناودەبات، هەروەک زمان بە ئامرازی پەیوەندی نێوان جەستە و بیر و هۆشەکان پێناسە دەکات، و لای فۆسلەر)١٨٧٢- ١٩٤٩)یش؛ زمانی ئایین و نەتەوە یەک نیشتمانی گیانی ئەو نەتەوەیەیە، بۆیە کاتێک کەسێک رێگای پێنادرێت بە زمانی خۆی قسە بکات ئەوە نیشتمانی لێ قەدەغەکراوە. تۆین مورتەزا (٢٠٠٧) پێیوایە، زمان روخساری گەشی مێژووە، مێژووش پێناسەی نەتەوەیە، کەواتە زمان سیفەتی نەگۆڕی هەیە کە بە هیچ شێوەیەک لە نەتەوەکان جیاناکرێتەوە مەگەر بە کۆتایی هاتنی ئەو نەتەوانە.

## کۆتایی

لە کۆتاییدا، پاش ئەوەی کەلەپووری ئیسلامیی، بەشەکانی و (زمان)یش وەک یەکێک لە پێکهێنەرە سەرەکییەکان روونکرانەوە، چاودەگێڕینەوە سەر ئەوەی کە ئەگەرچی تێگەشتنەکان بۆ رۆڵی زمان وەک یەکێک لە پایەکانی کەلەپووری ئیسلامیی لای موسڵمانان بە شێوەیەکی گشتی تێگەیشتنێکی سادە و گرنگیپێدانێکی ناسەرکەوتوو بووە، بەڵام لای نەیارانی ئیسلام و کەلەپووری ئیسلامیی پیلانی جیاواز لەو چوارچێوەیەدا جێبەجێکراون، کە لە گرنگترین نموونەدا، گۆڕینی ئەلفابی تورکی لە تورکیا لە لایەن کەمال ئەتاتورکەوە لە ئەلفبای ئیسلامیی (عەرەبی)یەوە بۆ لاتینی، کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر هەموو چالاکییەکان ئیسلامییەکان، لە کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، کەلتووری، فەرهەنگیی و هونەرییەوە، ئەوەش بە شێوەیەک لە شێوەکان کاریگەری ناتەندروستی هەبووە لەسەر شێواندنی کەلەپوور و شارستانێتی ئیسلامیی.

لە ئەنجامدا دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە؛ زۆر گرنگە سەنتەر و ناوەندە رۆشنبیرییە ئیسلامییەکان گرنگی زیاتر بخەنە سەر رۆڵی زمان و هێزی زمان وەک پارێزگارییەک لە کەلەپووری ئیسلامیی. هەروەک پێویستە بە مەبەستی گەشەپێدان، رێکخستن، فروانکردن، و دەوڵەمەندکردنی زمان لە ناوەندە ئیسلامییەکاندا تەنها لەسەر زمانی عەرەبی کارنەکرێت بەڵکو هەموو خێزانی زمانی موسڵمانان بکرێنە خێزانی زمانی کەلەپووری ئیسلامیی و گرنگیان پێبدرێت. هەروەک گرنگە لە کوردستاندا ئەو شاکارە هونەریانەی دەچنە چوارچێوەی کەلەپووری ئیسلامییەوە لە لۆکاڵی دەربچن و ببنە جیهانیی، هەر بۆ نموونە، شاکارەکانی مەحوی و نالی، نووسین و بەڵگەنامە ئیسلامییەکان، نووسین و خۆشنوسییەکانی موسڵمانان لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان، لە پێش هەمووشیاندا چالاکییەکانی زمانی کوردی وەک یەکێک لە بەشە گرنگەکانی کەلەپووری ئیسلامیی گەشەی زیاتریان پێبدرێت.

## سەرچاوەکان:


- العمايرة، محمد حسن، ٢٠٠٠، الفكر التربوي، عمان: دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة.
- يحيي، توين مرتضى، ٢٠٠٧، أثر العربية في ثقافة المسلمين، مجلة: إسهامات اللغة والأدب في البناء الحضاري للأمة الإسلامية، ماليزيا: دار التجديد للطباعة والنشر والترجمة.
- وافي، علي عبدالواحد، ١٩٦٢، فقه اللغة، القاهرة: دار النهضة.
- خليل، عماد الدين، مؤتمرات حول الحضارة الإسلامية، دار الصحوة للنشر والتوزيع.
- فاطمة گودرزى، (٢٠١٠). تأثير اللغة العربية على الثقافة الإسلامية. الاولة. حضارة الكلمة.
- Crystal, David. (1997). English as a Global Language. Cambridge: Cambridge University Press.
- Irvine, Alison. (2004). "A good command of the English language: Phonological variation in the Jamaican acrolect", in: Journal of Pidgin and Creole Languages 19: 41-76.
- Jenkins, J. (2006). Current perspectives on teaching world Englishes and English as a lingua franca. TESOL Quarterly, 40(1), 157-181.
- Kachru, B. B. (1997). World Englishes and English-using communities. Annual Review of Applied Linguistics, 17, 66-87.
- Kachru, B. B. (1991). Liberation linguistics and the Quirk concern. English Today, 25, 3-13.
- Mufwene, S. (2005). Globalization and the myth of killer languages: What's really going on. Perspectives on endangerment, 5, 21.
- Nettle, Daniel/Suzanne Romaine. (2000). Vanishing Voices: The Extinction of the World's Languages. Oxford: Oxford University Press.
- Phillipson, Robert. (2003). English-only Europe? Challenging Language Policy. London: Routledge.
- Price, Glanville. (1984). The Language of Britain. London: Edward Arnold.
- Seidlhofer, B. (2005). English as a lingua franca. ELT journal, 59(4), 339.
- Zughoul, M.R. (2003). Globalization and EFL/ESL Pedagogy in the Arab World. Retrieved From; http://eric.ed.gov/

# کێ
# کەلەپووری ئیسلامیی
# هەڵاوێر دەکات؟


**جەعفەر گوانی**

لە دایکبووی ساڵی (١٩٨٠) دەڤەری سۆران.

هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە زانستە ئیسلامییەکان.

ئەندامی مەکتەبی تەنفیزی یەکێتی زانایانی ئیسلامییە.

نۆ بەرهەمی نووسین و وەرگێڕانی چاپ بووە.

یـــــەک لـــە خـــاڵە بـــەهێزەکانی بەردەوامی گەشەسەندنی پەیامی ئیسلام گونجانیەتی بۆ هەموو شوێن، سەردەم، نەتەوە و گەلێک، کە بە جیهانبینیی و گەردوونیی وەسفدەکرێت، بۆیە هەر کاتێک سەردەم و شێوازێکی تازە هاتبێتە پێشەوە، زانایانی ئیسلام پێداچوونەوەیان بە فیکر و فیقهی ئیسلامیی کردۆتەوە، تا دواجار لە ئاست خواستەکانی قۆناغی تازە بێت و وەڵامی پرسیارەکانی ئەم ساتەوەختە بداتەوە، ئەمەش پێویستی بە نوێبوونەوە هەیە، چونکە هەرگیز تەواوی وەڵامەکانی دوێنێ، وەڵامی ئەمڕۆ نین، هەروەک ئەوانی ئەمڕۆش بەرسڤی سبەی نابن، بۆ ئەمەش هەمیشە کۆمەڵە زانایەک بوونەتە پێشەنگی ئەم چاکسازی و پێداچوونەوەیە، زۆربەی جارانیش کەوتوونەتە بەر لۆمەی لۆمەکاران.

ئەم حاڵەتە لە مێژووی موسڵمانان بەردەوام بووە، تا گەیشتووینەتە سەدەی بیستەم، لەوێوە بەداخەوە باراشی موسڵمانان کەوتووە و لە بنە هەمبانی وەڵامەکانی دوێنێوە بە دوای وەڵامەکانی ئەمڕۆ دەگەڕێین، دواجار نەک وەڵامەمان دەستنەکەوت، بەڵکو گورگانخواردی بەردەوام لە ناو گێژەڵۆکەی رووداوەکان دەسووڕێینەوە، هەر رووناکییەک ببینین وا دەزانین ئەوە نووری دارەکەی حەزرەتی موسایە و دنیای پێ رووناک دەکەینەوە، رێگای خۆی پێ دەبینینەوە، کەچی لە نیوەی رێوە شەرمەزارمان دەکات، بەجێمان دێڵێت، بۆمان دەردەکەوێت ئەوە خدری زیندە نەبوو.

ماوەی سەدەیەکە موسڵمانان لە دارماندان، بەشێکی ئەو داتەپینەمان بۆ نەمانی خیلافەتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، کە سەرباری هەموو کەموکورتییەکان، لە داکەوتنەکان هەڵیدەستاندینەوە، ئەوەی ئەحکامی عەدلییەی عوسمانییەکانی خوێندبێتەوە، چاک دەزانێت چەندە نوێبوونەوەیان لە فیکر و فیقهی ئیسلامیی کردووە، بەشێکی دیکەی هۆکارەکانیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە موسڵمانان کەوتوونەتە بن بەرداشی زانایان و بیرایاران و شارەزایانی ئیسلام، کە بوونەتە دوو بەشەوە:

بەشێکیان ئەوەندە وشکن دەیانەوێت بە تۆزقاڵ و تەنها سەرەداوێک لەوەی رابردوو لانەدەن، ئیجتیهادی زانایان لای نەوان هەمان پیرۆزی قورئان و فەرموودەی وەرگرتووە، بۆیە ئەوەی تۆزێک لەو خەتە لابدات یەکسەر مۆری دوژمنداری لە ناوچاوانییەوە دەدەن، لە کۆڕ و مەجلیسەکان ناوی دەزڕێنن، بە حسابی ئەوانە بێت دەستبردن بۆ ئیجتیهادێک لە فیقهی ئیسلامیی گوناهە، تەنها لە چەند شتێکی دیاریکراویش نەبێت دەست بۆ مەزهەبەکانی دیکەش نابەن، ئەوانە موسڵمانانیان هێندە وشککردووە، جورئەت بە کەس نادەن زانستی خۆی بخاتە ئەو مەیدان، چ وەکو فیقهو شەریعەت، یان فیکر، یان خوێندن و شێوازەکانی، نەک بکەوێتە بەر زمانی تیژی لۆمەیان، سەیر نییە ئەگەر گوزەرانی ژیانیشی بکەوێتە بن مەترسییەوە.

بەرامبەر بەوانە کۆمەڵێکی تر هاتوونەتە گۆرەپانەکە، ویستوویانە چاکسازی بکەن، پێداچوونەوە بە گوتاری ئایینی و بنەماکانی فیکر و فیقهی ئیسلامییدا بکەن، بەڵام ئەوانیش لە نیوەی رێگەدا کاروانیان کەوتووە، هیچییان بە هیچ نەکردووە، لە دەنگەدەنگێک بەولاوە چشتێکیان نەدووریوەتەوە، هۆکاری سەرەکی ئەم بێبەرهەمییەشیان نارەسەنبوونی هەوڵ و چالاکییەکانیانە، چونکە لە پەنای باسکردنی چاکسازی لە دینداری موسڵمانان، پێداهەڵگوتنێکی زیاد لە پێویست بۆ فیکری غەربی و شارستانی رۆژئاوایی دەردەبڕن، ئەمەش ئەوانی لە واقیعی کۆمەڵگەی موسڵمانان دابڕیوە، خەڵک وا تێدەگەن ئەوانە کارییان لێدانی ئیسلامە نەک چاکسازیکردن، بێگومان قسەکانمان رووە و ئەو زاتە بەرزانە نییە، کە هەوڵ و کۆششی تاقانەی بێ تەقەلایان کردووە،

**پێداچوونەوە و هەڵاوێرانی کەلەپووری ئیسلامیی و ساغکردنەوەی لەگەڵ دەقە پیرۆزەکان پێویستییەکی حەتمی ئایینی و جڤاتی و مرۆییە.**

لە دەرەنجامیشدا ئەگەر چاکسازیش نەکرابێت، ئەوا دەلاقەیان بە رووی هەزاران زانا و بیریار کردۆتەوە، لە چەند بوارێک سوودیان لێوەرگیراوە، نەخاسمە لە رەتدانەوەی گومانەکان و هەموارکردنەوەی یاساکان، بە تایبەتی یاسای باری کەسیی، وەک ئەوەی لە میسر لەسەردەستی کەسانی وەک شێخ محەممەد عەبدە و قوتابییەکانی روویدا.

کەواتە پێداچوونەوە و هەڵاوێرانی کەلەپووری ئیسلامیی و ساغکردنەوەی لەگەڵ دەقە پیرۆزەکان پێویستییەکی حەتمی ئایینی و جڤاتی و مرۆییە، بۆ ئەوەی چیدیکە لە دەورەی خۆمان نوسوورێینەوە، کاروانەکە لە پێشڤەچوون بەردەوام بێت، کەشتییەکە لە کەناری ئارامییەوە لەنگەر بگرێت، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە: کێ کەلەپووری ئیسلامیی هەڵاوێر دەکات؟.

بێگومان ئەوانەی بە ئەقڵی (موتەحەجیر) دەست بۆ چاکسازی دەبەن، هەرگیز شتێک بە شتێک ناکەن، چونکە ئەگەر ئیجتیهادی زانایانیش بووە بەڵگەیەکی شەرعی شان بە شانی قورئان و دەرفەتی پێداچوونەوە نەما، ئەوا ناتوانن مەلەوانی لە گۆمەکەدا بکەن، بەرامبەر بەوانیش ئەوانەی کارەکانیان بۆ ئەوەیە تا دەستخۆشییەکیان لێبکرێت و لە راگەیاندنەکان ستایشیان بکرێت و خەڵات بکرێن، ناتوانن هیچ هەڵاوێران بکەن، چونکە چاکسازی و هەڵاوێران بەو کەسانە دەکرێت، کە شانازی بە مێژووی پرشنگداری موسڵمانانەوە دەکەن، وەک هەڵگورد بە ئیسلامەوە سەربەرزن، بە پێچەوانەوە هەوڵدان بۆ رەتکردنەوەی فەرموودە و ناونانی بوخاری و شافیعی بە تاوانبار، هەرگیز چاکسازییان لێوە هەڵناپڕووچێت، چونکە ئەوە لە بنەڕەتدا داماڵینی هەموو پیرۆزیەکە و دابڕاندنی موسڵمانانە لە مێژوویان.

زاتێکی وەک ئیمامی غەزالی بۆ ئیسلام دەسووتا، بۆیە ئیحیای علومەکانی دینی کردەوە، شێخ محەممەد عەبدە لە هەر کەسێک پتر شەونخوونی بۆ ئیسلام دەکرد، ئیمامی ئەبولحەسەنی ئەشعەری بە گیرفانی بەتاڵییەوە شەو تا بەیانی لە شەونوێژ فرمێسکی دەڕشت، دڵەکەی لەگەڵ قورئان دابوو، لەگەڵ ژان و ژینی موسڵماناندا بوو، بۆ دەستکەوتنی وەڵامی پرسیارێک شەونوێژ و شەونخوونیان دەکرد، ئیمامی نەوەوی رای نوێی دەخستە ناو فیقهی شافیعی بەبێ ئەوەی پێی بڵێت: تاوانبارە یان بۆ ئەم سەردەمە ناشێت، هەروەک خۆیان نەکردە پاشکۆی هیچ سیاسەتێک بۆ ئەوەی چاکسازییەکە شتێکی زاتی ئەم قۆناغەی مرۆڤایەتی و موسڵمانان بێت، نەک بە پاڵنەری بەرژەوەندی سیاسیی بۆی بچێت، بۆیە ئەوانەی بە دەگمەنیش لە مزگەوت نابینرێن و فرمێسک چاوەکانیان تەڕ ناکات، چواردەوری خۆیان بە کەسانی زانا و عاریف پڕ ناکەنەوە، هەرگیز چاکسازییان پێناکرێت، دکتۆر مستەفا زەڵمی ئەگەر نەڵێت دەست بە قورئان و فەرموودەوە بگرن، لە توێژییەنەوەکانی بە شانازییەوە رایەکانی شافیعی و حەنەفی و زانایانی ترباس نەکات، لە پشتی یادەوەرییەکانی بە فەخرەوە ئیسلام بە سەرچاوەیەکی هەموو یاسا گەورەکان دانەنێت، خوێنەری کتێبەکانی لە زیادبوون نەدەبوون و گوێ لە قسەکانی نەدەگیرا. بە کورتی و پووختی: لە نێوان ئەم دوو رەوتە وشکە، پێویستمان بە ریفۆرمیستە راستەقینەکان هەیە، کە دەبێ کەسانێکی (زانا، دانا، ئازاد، بوێر، موخلیس) بن.

**گرنگە عەقیدە و ئیمان لە چەند بابەتێکی کەم سنووردار بکەین، بەمەش ڕێگە دەگرین لەبەردەم بەکارهێنانی عەقیدە بۆ مەبەستی سیاسیی.**

**(الاسماعیلیة)، (البهائیة)** و **(القادیانیة)** تا کۆتایی جۆرەکان و سەردەمەکانیان؟ بێگومان ناوی ئەوانە نەهاتووە، چونکە سەردەمی هەڵبەستنی فەرموودە تێپەڕیوە و لەو سەردەمە ئەو تایفانە نەبوون بۆیە بۆ نموونە کەس ناتوانێت فەرموودەی **(القادیانیة یان اللبرالیة شرار هذه الامة )** هەڵبەستێت.

کۆی ئەو فەرموودە لاوازانەش کە دژ بە قەدەرییەتە بۆمان ئاشکرا دەکات کە ئەو دەقانە لە میانەی ململانەی تاقمەکان هەڵبەستراون. بەڵگەیەکی ئەوەی کە ململانەی فیکریی و مەزهەبیی و سیاسیی هۆکاری یەکەمی هەڵبەستنی ئەو جۆرە فەرموودانەیە، ئەوەیە کە سزای ئاخیرەت بۆ تاقمە نەیارەکان دانراوە وەک ئەو فەرموودەیەی دەڵێت: کە ڕۆژی قیامەت هاتەپێش کەسێک هاوار دەکات: با نەیارەکانی خودا (یاخود دوژمنانی خودا) هەڵسن ئەوانیش قەدەرییەکانن (لە **- کتاب السنة-ي ابو بکر عمرو ابن أبي عاصم** هاتووە، ئەلبانیش دەڵێت سەنەدەکەی لاوازە)[5].

## عەقیدە وەك ڕێگەیەکی کورتی زاڵبوون بەسەر نەیاران

لەبەر ئەوە ئاسایی بوو کەسانێک فەرموودە هەڵبەستن و دوایی هی تریش هەڵبەستن بۆ حەلالکردنی خوێنەکەیان، وەک چۆن گێڕانەوەیەک هەیە کە گوایە عومەر کوڕی عەبدولعەزیز سەبارەت بە قەدەرییەکان وتوویەتی کە تەوبەیان پێ بکرێت و ئەگەر تەوبەیان نەکرد بکوژرێن، کە ئەمە هەمان قسەی ئیمام مالکە. ئەلبانیش دەڵێت سەنەدەکەی صەحیحە بەڵام **(مقطوع)**ە[6]، واتە گێڕانەوەکە فەرموودە نییە، بەڵکو قسەی عومەر و مالکە. ئەوەش بەمەرجێک غەیلانی دیمەشقی قەدەری بوو و فەرمانبەرێکی عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بوو و فرۆشتنی موڵکەکانی بەنو ئومەیەی پێ سپێرراردبوو. ئەو باوەڕەی غەیلانیش بە قەدەریەت، کرایە بیانوو بۆ کوشتنی غەیلانیش لەدوای مردنی عومەر، بەڵام وەک باسکراوە هۆکارەکەی سیاسیی بوو، ئەویش بەهۆی ئەو کارەی کردبووی و لەبەر ئەوەی کاتی فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانە هاواری دەکرد: وەرن بۆ کەلوپەلی ستەمکاران. دیارە ئەم نارێکییە (واتە عومەر کە خەلیفەیەکی خواناس بوو کاروبار بداتە دەستی کەسێکی قەدەری)، وای کردووە بوترێت گوایە غەیلان کاتی عومەر تەوبەی کردبوو و دوای مردنی گەڕایەوە بۆ قەدەرییەت.

ئەم نموونەیەی قەدەرمان وەرگرت نەک بۆ ئەوەی بڕیار بدەین قەدەر هەیە یان نییە، چونکە ئەمە مەبەستی ئەم بابەتەمان نییە، بەڵکو بۆ سەلماندنی ئەوەی چۆن ناکۆکیی فیکریی نێوان موسڵمانان خۆی خنیبووە ناو باوەڕ و عەقیدەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئاسانترین و کورتترین ڕێگە بۆ بردنەوەی جەنگێکی فیکری ئەوەیە تێکەڵ بکرێت بە باوەڕ. مەسەلەی قەدەر کێشەیەکی زۆر گەورەی دروست کردبوو، بەشێکی گەورەی هۆکاری ورووژاندنی باسەکەش سیاسیی بووە، ئەویش بەهۆی ستەمکاریی بەنو ئومەییە لەلایەک و ئاژاوە خوێناوییەکانی ناو موسڵمانان کە بە کوشتنی عوسمان کوڕی عەففان دەستی پێکرد لەلاکەی تر. هەر لەمیانەی هەوڵی بردنەوەی جەنگ دژی باوەڕی قەدەرییەت پەنا بۆ هەڵبەستنی فەرموودەی دژ بەو فیکرەیە برا.

## قورئان بڕیاردەرە لەسەر ئەوەی کێ لە قیامەت ڕزگاری دەبێت

هەر لەم ڕوانگەیەوە ئەو فەرموودانەی باسی کۆمەڵانێکی ئوممەت دەکەن بە خراپە و ئاکامەکە تیاچوونی ئاخیرەتی بێت، جێگەی گومانن، چونکە بڕیاری گرنگی لەم جۆرە پێویستە قورئان ڕوونی بکاتەوە، وەک چۆن بۆی ڕوونکردبووینەوە کە ئەو بەشانەی ئەهلی کتاب کە لە ئاییني ڕەسەنی خۆیان لایان دابوو کافرن و بڕیارێکی وا بۆ فەرموودە جێنەهێڵراوە. هەموو ئەوەش چونکە کارێکی زەحمەتە بڕیاری تیاچوونی ئاخیرەت بدەین بۆ کەسانێک بەپێی فەرموودەکان کە لای زۆربەی هەرە زۆری زانایان فەرموودە **(ظني الثبوت)**ـە، واتە ئەگەرچی سەنەدی صەحیح بێت و هیچ **(علة)** و **(شذوذ)**ی نەبێت، بەڵام هێشتا ناتوانین بڵێین سەد لە سەد پێغەمبەر بەڕاستی وتوویەتی. پێویستە بڕیاری لەو جۆرە لە قورئان وەربگرین کە قورئان **(قطعي الثبوت)**ـە واتە سەد لە سەد باوەڕمان بەوە هەیە لە خواوە هاتووە و بەهەمان دەق و بێ دەستکاری. ئەوەندەش بەس نییە بڕیاری لەو جۆرەش (واتە ئاکامی ئاخیرەت بۆ کەسێک یان تاقمێکی دیاریکراو) لە قورئان هاتبێت، بەڵکو پێویستە سەد لە سەد لە تەفسیری ئەو ئایەتانە دڵنیا بین کە تەنها یەک تەفسیر هەڵدەگرن واتە **(قطعي الدلالة)** بن.

هەر سەبارەت بە نموونەکەی خۆشمان، واتە قەدەر، هیچ شتێکمان نییە لە قورئان **(قطعي الدلالة)** بێت کە قەدەر هەیە یان نییە، بۆیە ئەوانەی باوەڕیان بە قەدەر هەیە و ئەوانەی باوەڕیان پێی نییە، لەسەر یەک زەوی دەوەستن کە زەویی بۆچوونە نەک باوەڕ. بەم جۆرەش باوەڕی هەردوو لایەنە ناکۆکەکە باوەڕ نییە، بەڵکو بۆچوون و ئیجتهادی مرۆڤە.

**لە ئەنجامی ئەو ململانە فیکرییە، کە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری سیاسیی، سەیر نییە ئەگەر فەرموودەی دژ بە مێژوو و واقع و عەقڵ و مەنتق هەڵبەسترێن.**

یەکێکیش لە پێداویستییەکانی ڕزگارکردنی عەقیدە ئەوەیە فەرموودەی ئاحاد[٧] لە بواری عەقیدە قبووڵ نەکرێن، ئەویش بەپێی ئەو ڕاستییە سادەیەی کە نە دین و نە عەقڵ قبووڵی ئەوە ناکات فەرموودەیەکی ئاحادی تایبەت بە مەسەلەیەکی ئیمان چارەنووسی مرۆڤمان بۆ دەستنیشان بکات کە بۆ بەهەشت بچێت یان بۆ دۆزەخ. بەکورتی: بەپاڵ مەترسیی ئەوەی فەرموودە هەڵبەسترێن بۆ بڕیاردان لەو مەسەلانەی موسڵمان لەبارەیانەوە بەتوندی ناکۆک بوون، جێگەی مەترسییە فەرموودە خۆی وەک دەقێکی **(ظني الثبوت)** بڕیاردەر بێت لەو مەسەلانە، تەنانەت ئەگەر بە فەرموودەیەکی صەحیحیش ناوبرابێت.

## فراوانکردنی عەقیدە و بەرتەسککردنی ڕزگاربووان

لێکۆڵینەوە و موناقەشەی سەدە یەکەمەکانی مێژووی ئیسلام لەبارەی عەقیدەوە، دوو ئەنجامی دژ بەیەکیان لێ دروست بوون، ئەوانیش فراوانکرن و بەرتەسککردن. مەبەستم لە فراوانکردن ئەوەیە بواری عەقیدە شتی زۆری بۆ زیادکرا، ئەنجامی ئەو فراوانکردنەش بەرتەسککردن بوو واتە قۆرخکردنی باوەڕی دروست بۆ تاقمێکی دیاریکراوی ئوممەت. بەواتایەکی تر ئەو تاقمانەی

که زیادکردنی پایە و مەرجەکان ئیمانیان پیادەکرد (فراوانکردن) وایان کرد تاقمی زۆری تری نەیارانیان لە بازنەی ئیمان (یان ئیمانی دروست) دەربهێنرێن و تەنها تاقمەکەی خۆیان بمێننەوە (بەرتەسککردن). ئەم چالاکییەی فراوانکردنەش بە یەک جار و لەپڕ ئەنجام نەدرا، بەڵکو وردەوردە و لەمیانەی ناکۆکیی نێوان تاقمەکان. بەرتەسککردن گەیشتە ئەو حاڵەتەی تەنها یەک تاقم بە ڕزگاربوو بزانرێت **(الفرقة الناجية)** و ئەمە لوتکەی ناکۆکیی مەزهەبی بوو کە تەنها یەک لوتکە لەو بەرزتر هەبوو، ئەویش شەڕی مەزهەبی.

## گواستنەوەی ناکۆکیی تاقمەکان بۆ ناکۆکیی لە عەقیدە

هۆکارێکی گرنگی ئەو زاڵبوونەی فیکر و بۆچوونی بەشەری کە دەمامکی لەخۆی نا و خوی وەکو عەقیدە پیشان دا ئەوەیە کە پێشتر باسمان کرد، ئەویش ناکۆکیی فیکریی نێوان موسڵمان، واتە ناکۆکیی فیکری بەرێگە دروستەکەی نەڕۆشت کە وەکو جیاوازیی بۆچوون بمێنێتەوە، بەڵکو زۆر تەئکید لەسەر ئەو فیکرە کرا بەجۆرێک کرایە عەقیدە.

ئەوانە زۆرن کە تەنگەتاو دەبن بە هەبوونی کەسێکی موخالیفی فیکری خۆیان. مرۆڤیش بۆی هەیە پەنا بۆ ئاسانترین چارەسەر بەرێت، ئەویش ناکۆکیی لەگەڵ نەیارەکان بکرێتە ناکۆکی لەگەڵ خودی ئیسلام، بەم شێوەیە دەرکردنی ناکۆکییەکە لە بواری فیکری شەخسییەوە بۆ بواری ئیمانی هەموو موسڵمانان.

ناکۆکییە شەخسییەکان و ئەو ناکۆکییەی نێوان تاقمەکان لە هەندێک حاڵەت و لای هەندێک کەس بارەکە دەگەیەننە قۆناغی تەکفیر، بەڵام لەبەر ئەوەی تەکفیری موخالیف بەپێی بۆچوونی مرۆڤەکان ناکرێت، پێویست دەکات مەسەلەکە بخرێتە قاڵبی باوەڕ، نەک بۆچوون و ئیجتهاد. زۆر جار ناکۆکییەکە دەگاتە سنووری ئێسقان شکاندن و جاری واشە قسە و بەڵگەی سەیر و سەمەرە دەکرێن.

تێخنینی ئیمان لەناو مەسەلەکانی ناکۆکی، تەنانەت دەگاتە بابەتی فیقهی، وەک چۆن تەحاوی **(الطحاوي)** کە ئیمامێکی دیارە، نامیلکەیەکی لەبارەی عەقیدەوە هەیە کە بە عەقیدەی تەحاویە ناسراوە، هەرچەندە شتی دروستی لەخۆ گرتووە، بەڵام گیانی ناکۆکی وای کردووە مەسەلەیەکی فیقهیی وەک (المسح علی الخفین) بکاتە بەشێک لەو عەقیدەیە[٨].

مرۆڤیش لای سەیر دەبێت، چۆن مەسەلەیەکی فیقهی جێگەی خۆی لەناو نامیلکەیەکی بچووک دەکاتەوە و لەناو سەدان مەسەلەی فیقهی جێگەی خۆی لەناو عەقیدە دەکاتەوە. سەرسوڕمانەکەش ئەو کاتە لادەچێت کە دەزانین خەوارج و شیعە باوەڕیان بە دروستیی مەسح لەسەر پێڵاو نەبوو[٩]. بەواتایەکی تر ناکۆکیی مەزهەبیی و سیاسیی هۆی ئەوە بووە مەسەلەیەکی فیقهیی بچووک ببێتە بابەتێکی عەقیدەیی[١٠]. هەر بۆیە و بۆ تەئکیدکردنی ئەو جیابوونەوەیەی تاقمەکان، مەسح لای هەندێک تەنانەت باشترە لە شتنی پێ، وەک **(ابن المنذر)** کە دەڵێت: خیلافێکی نێوان زانایان هەبووە کە ئایا کامیان باشترە (کاتێک مرۆڤ خوففی لەپێ بێت) مەسحیان لەسەر بکات، یان دایانکەنێت و پێی بشوات. ئەویش دەڵێت: لای من باشترە مەسحیان لەسەر بکات، ئەویش لەبەر ئەهلی بیدعە لە خەوارج و ڕەوافز کە تانەیان لە مەسح دابوو[١١]. دیارە هەر لەبەر ئەوەشە ئیبنو تەیمیە، هەر وەکو تەحاوی، دەیخاتە ناو مەسەلەکانی عەقیدە[١٢]. هەروەها لە ناو شێخە سەلەفییەکانی ئەم سەردەمە ئەوە ڕەت نەکراوەتەوە، بۆ نموونە شێخ بن باز لە تەعلیقە

کورتەکانی لەسەر عەقیدەی تەححاوی قبووڵی کردووە و هیچی لەبارەوە نەوتووە[٣١]. صالح ئەلفوزانیش لە تەعلیقەکانی خۆی پاساوی ئەوە دەهێنێتەوە کە موبتەدیعەکان ئینکاریان کردووە و ئەهلی سوننەت جێگیریان کردووە[٤١].

## ئەسڵی کێشە مەزهەبییەکان سیاسییە

بەڵام ئەگەر مەسەلەیەکی فیقهیی بچووک لەبەر ئەوەی جێگەی ناکۆکیی نێوان تاقمەکان بووە بخرێتە ناو بابەتەکانی عەقیدە و ئەوە نەبێتە کێشەیەکی گەورە، ئەوا بابەتی تر هەن کە کێشەیەکی زۆر گەورە و بەردەوامیان بەدواوە بوو، وەک ئەوەی پێشتر باسمان کرد، سەبارەت بە ناکۆکیی سیاسیی. نموونەیەکی تریش مەسەلەی ئیمامەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیبە کە شیعە باوەڕهێنان بە وەسیەت (واتە وەسیەتی پێغەمبەر بۆ عەلی کە ببێتە خەلیفەی دوای خۆی) و وەلایەتی عەلی دەکەنە بەشێک لە ئیمان و ئیسلام. نموونە لەو بارەیەوە زۆرە، تەنها دوو گێڕانەوە لە کتێبی (الکلینی) کە بە بوخاریی شیعە ناسراوە دەهێنینەوە.

لە گێڕانەوەیەک کەسێک لە جەعفەر ئەلصادق لە بارەی ئیمانەوە دەپرسێت، ئەویش گوایە چەند شتێکی بۆ دەژمێرێت وەک شایەتمان ، نوێژ، زەکات، رۆژوو و حەج، ئینجا **(و وَلايةُ ولينا وعداوةُ عدونا والدخول مع الصادقينَ)[٥١]**. لە گێڕانەوەیەکی تر گوایە ئەلصادق دەڵێت ئیسلام لەسەر پێنج شت بینات نراوە: نوێژ، زەکات، رۆژوو، حەج و وەلایەت[٦١]. شتی زۆری تریش هەن بۆ بەستنەوەی ئیمان و ئیسلام بە وەلایەتی عەلی و نەوەکانی. ئەو وەلایەتە سەرەتا سیاسیی بووە و دژایەتیکردنی ئومەوییەکان بوو (وەک چۆن خەڵکی زۆری سوننەش هەبوون دژایەتیی ئومەوییەکانیان دەکرد لەبەر ئەوەی ستەمکار بوون)، بەڵام دواتر بووە بابەتێکی مەزهەبی و ئیمانی. هەر ئەو ستەمکارییەی ئومەوییەکان، هەروەها ئەو شەڕ و ئاشووبانەی تووشی ئوممەت ببوون هۆکار بوون بۆ وروژاندنی مەسەلەی قەدەر و ئازادیی هەڵبژاردن، وەک لە پێشتر باسمان کرد و هەندێک لێکۆڵەرەوە درکیان پێکردبوو.

ئەم نموونانە و نموونەی تری تاقمە ئیسلامییەکانی ئەو سەردەمانە دەیسەلمێنن کە سەرەتای کێشەکان سیاسیی بوون، نەک عەقیدەیی و فیکری، دواتر ئەو مەسەلانە خرانە ناو بابەتەکان عەقیدە، هەر بۆیە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە ئەو تەرحە عەلمانییەی کە دەیەوێت کێشەکان لە سنووری سیاسەت بهێڵرێنەوە و لە بواری ئایین دەربکرێن، گوایە کێشەی ئایینی مەترسیداترە بەڵام کێشەی سیاسی ئەهوەنترە. بەبۆچوونی خۆمان ململانەی سیاسیی ئەسڵی گۆڕینی ناکۆکیی ئایینی و مەزهەبییە بۆ ناکۆکییەکی توندوتیژ تا دەگاتە جەنگی ئایینی و مەزهەبی. ئەوەش تەنانەت بۆ مەسیحییەت ڕاستە کە جەنگی مەزهەبیی هەوڵەکانی کەنیسەی کاسۆلیکیی بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتی خۆی لەپشتەوە بوو.

ستەمکاری، هۆکاری ئەو کێشە سیاسییانەشە کە پەلیان هاویشت بۆ کێشە و ململانەی مەزهەبی، چونکە لە کەشوهەوای ستەمکاری تیۆری سیاسی لەدایک دەبن، وەک چۆن لە رۆژئاوا دەیبینین کە تیۆرە سیاسییە جۆراوجۆرەکان لە سەردەمەکانی ستەمکاری و کێشە سیاسییەکان سەریان هەڵدا، بەڵام ئێستا کە ئەو ستەمکارییە بەو جۆرەی ئەوسا نەماوە، رۆژئاوا وەکو نەزۆک وایە سەبارەت بە تیۆری سیاسیی، مەگەر ئەو تیۆرانەی کە ململانەی رۆژئاوا و رۆژهەڵات دەکەنە بابەتی خۆیان.

لەبەر ئەمەش دیارە کەمکردنەوەی بابەتەکانی عەقیدە چەند گرنگە؛ کاتێک عەقیدە و ئیمان لە چەند

**تەححاوی کە ئیمامێکی دیارە، نامیلکەیەکی لەبارەی عەقیدەوە هەیە، هەرچەندە شتی دروستی لەخۆ گرتووە، بەڵام گیانی ناکۆکی وای کردووە مەسەلەیەکی فیقهیی وەك (المسح علی الخفین) بکاتە بەشێك لەو عەقیدەیە.**

بابەتێکی کەم سنووردار بکەین، نەک تەنها هۆکارە سیاسییەکانی پشتی ئەو ناکۆکییە عەقیدەییانە لە عەقیدە دووردەخەینەوە، بەڵکو هەروەها رێگەش دەگرین لەبەردەم بەکارهێنانی عەقیدە بۆ مەبەستی سیاسیی.

### فیکر و لێبوردەیی

بەم جۆرەش هەموو مەسەلەکانی عەقیدە وەک قەدەر و تەفسیرکردنی ئەسمائوسیفات ... تاد دەبوایە بەشێک بوونایە لە فیکر، یان بۆچوون کە خاوەنەکەیان پێیان کافر نابێت، بەم پێیەش کە قسەکان لەبارەی بۆچوونی مرۆڤ بن، مرۆڤەکان زۆرتر لەوە نزیک دەبنەوە کە بۆچوونی جیاواز قبووڵ بکەن و دوورتر بن لە فیتنە و ئاژاوە.

ئەم قبووڵنەکردنەی بۆچوونی موخالف بەو پێیە کە ئەوە بۆچوون نییە، بەڵکو دینە لە بوارێکی تریش هەبوو، ئەویش بواری فیقهـ کە دەبوایە بواری نموونەیی بووایە بۆ بۆچوونە دژ بە یەکەکان بەڵام لەو بوارەش دەمارگیری بۆ ئیمامەکان هەبوو لەو حاڵەتەی شوێنکەوتەکانیان وەکو دین تەماشای بۆچوونە فیقهییەکانی ئەو ئیمامانەیان دەکرد، هەر کەسێک لێیان لا بدات گوناهبار دەبێت. نەک تەنها عەوامی خەڵک وایان بیردەکردەوە، بەڵام هەروەها زۆرێک لە فەقیهە دەمارگیرەکان کە موقەللیدی ئیمامەکانی خۆیان بوون.

### سوودی ئازادکردنی عەقیدە بۆ بانگەواز بۆ ئیسلام

ئەم تەرحە سوودێکی گەورەی هەیە بۆ غەیری موسڵمانان. چونکە ئەوانەی حەز بە موسڵمان بوون دەکەن چەند بیروباوەڕێک ڕووبەڕوویان دەبێتە کە بۆیان هەرس ناکرێت، وەک چۆن ئاڵۆزیی عەقیدەی مەسیحی و ناکۆکیی تاقمە مەسیحییەکانیان پێ هەرس ناکرێت. کەسێک حەزی بە ئیسلامە، دەبینێت چۆن هەر تاقمێک ئەوانی تر بە گومڕا دەزانێت و ناکۆکییەکەی خۆی لەگەڵیان دەخاتە خانەی عەقیدە، بەڵام ئەگەر ئیسلامێک بە غەیری موسڵمانان پێشکەش بکەین کە ئەو بابەتانە دەخاتە خانەی فیکر، ئەو کاتە نەک تەنها لەو ناکۆکییە دووریان دەخەینەوە کە دەبێتە هۆی ناشیرینکردنی ئیسلام لایان، بەڵکو لەهەمان کات شتێکیان پێشکەش دەکەین کە لە کەلتووری خۆیان پێی ڕاهاتوون، بەتایبەتیش رۆژئاواییەکان، ئەویش کە زۆر بوار هی فیکر و بۆچوونی جیاوازە، نەک عەقیدە. یەکێکیش لەو کارەساتانەی بەر ئیسلام لە رۆژئاوا کەوتوون ئەوەیە تاقمە ناکۆکەکان کاتێک دەبینن کەسێکی ئەو وڵاتە بۆتە موسڵمان، هەندێکیان دەگەنە لای و دەست دەکەن بە ورپاکردنەوە لە تاقمەکانی تر و لە کەسانی تری موسڵمان، پێی دەڵێن ئاگات لە فلان کەس بێت، چونکە ئەوە باوەڕەکەیەتی و فلان تاقم ئەوە باوەڕەکەیان و خۆت بەدوور بگرە لێیان، ئەنجامەکەش ئەوەیە ئەو کەسە تازە موسڵمانبووە واز لە ئیسلام دەهێنێت، چونکە وا بیر دەکاتەوە کە بە بەرزی و دروستیی ئیسلام خەڵەتابوو، یان بەلای کەمەوە بۆ ئەوەی خۆی لەو سەرئێشەیە ڕزگار بکات.

## سەرچاوە و پەراوێز:

١ **ابو داود، سليمان بن الاشعث السجستاني، سنن ابي داود، كتاب السنة ، تحقيق شعيب الارناؤوط، محمد كامل قره بللي، عبداللطيف حرزالله، دار الرسالة العالمية، دمشق، ط١، ١٤٣٠-٢٠٠٩، باب في القدر، ح٤٦٩١، مجلد ٧، ص٧٧.**

٢ بۆ نموونە ئیمام ئیبنو حەزمی ئەندەلوسی ئەویش بۆ گێڕانەوەیەکی تر **القدرية والمرجئة مجوس... تا. ابن حزم الاندلسي، ابو محمد علي بن حزم، الفصل في الملل والاهواء والنحل، تحقيق د. محمد ابراهيم نصر و د. عبدالرحمن عميرة، دار الجيل، بيروت، ط ٢، ١٤١٦-١٩٩٦، ج٣، ص٢٩٢.** لە نوێکانیش شوعەیب ئەرنائووت کە دەڵێت: ئیسنادەکەی لاوازە: **سنن ابي داود، كتاب السنة، باب في القدر، ح٤٦٩١ (مجلد ٧، ص٧٧).** کێشەکەشی ئەوەیە ابو حازم سلمة بن دينار لە عبدالله کوڕی عمر دەیگێڕێتەوە بەڵام ابو حازم فەرموودەی لە ابن عمر نەبیستووە.

٣ **الالباني، محمد ناصرالدين، ظلال الجنة في تخريج السنة (كتاب السنة للحافظ ابي بكر عمرو بن أبي عاصم الضحاك بن مخلد الشيباني المتوفي في ٢٨٧ هـ ومعه ظلال الجنة في تخريج السنة)، المكتب الاسلامي، ط١، ١٤٠٠-١٩٨٠، ج١، ٣٣٨، ص١٤٩-١٥٠.** ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات لە: **(شرح العقيدة الطحاوية، ص٢٧٣).** هەروەها **الالباني، محمد ناصرالدين، صحيح وضعيف سنن ابي داود، مكتبة المعارف، الرياض، ط١ للطبعة الجديدة، ١٤١٩-١٩٩٨، مجلد٣، ص١٤٣.** هەروەها **صحيح الجامع الصغير وزيادته، مجلد ٢، ح ٤٤٤٢.**

٤ **الالباني، ظلال الجنة، ٣٢٥، ص١٤٢-١٤٣.**

٥ **الالباني، ظلال الجنة، ج١، ٣٣٦، ص١٤٨-١٤٩.**

٦ **ظلال الجنة، ج١، ١٩٩، ص٨٨.**

٧ فەرمووده ئاحاد: ئەوە فەرموودەیەیە کە موتەواتر نییە. موتەواتر ئەو فەرموودەیەیە کە لە چینەکانی سەنەدەکە ژمارەیەکی زۆر گێڕاویانەتەوە و رێی تێ ناچێت هەموویان لەسەر هەڵبەستنی فەرموودەکە رێککەوتبن. ژمارەکەش فەرموودەی (مەشهوور) دیاری دەکات کە ئەمەیان لە دوو کەس زیاتر، یان لە سێ کەس زیاتر لەهەر چینێکی سەنەدەکە گێڕاویانەتەوە، بەڵام ژمارەکە ناگاتە ژمارەی تەواتر لە زۆری. مەشهوور جۆرێکی ئاحادە، دوو جۆری تریشی هەیە: عەزیز کە گێڕەرەوەکان لەهەر چینێکی سەنەدەکە لە دوو کەس کەمتر نەبن، یان سێ کەس بن و نەگەنە ژماری مەشهوور، سێیەمیشیان غەریبە کە گێڕەرەوەکان یەک کەسن. بەشێکی ئەم جیاکردنەوەیە لە **السيوطي، جلال الدين، تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي، تحقيق ابو قتيبة نظر محمد الفاريابي، بيروت، مكتبة الكوثر، الرياض، ط٢، ١٤١٥، ج١، ل ٦٢١ء ٦٣٢.** وەک ئاشکرایە زانایان یەکدەنگ نین لەسەر ئەو بەشکردنە، وەک چۆن یەکدەنگ نین لەسەر زۆرێک لە مەسەلەکانی سەر بە زانستی فەرموودە.

٨ **الطحاوي، أحمد بن محمد، أبو جعفر، متن العقيدة الطحاوية، دار ابن حزم، بيروت، ط١، ١٤١٦-١٩٩٥، ص٢٥.** بەپێی چەند فەرموودەیەکی صەحیح (بوخاری و موسلم و غەیری ئەوان)، ئەگەر مرۆڤ بە دەستنوێژەوە پێڵاوی لەپێ کرد دەتوانێت لەجیاتی قاچ شتن لەکاتی دەستنوێژ بە دەستی تەڕەوە پێڵاوەکەی بسرێتەوە، ئەویش شەو و رۆژێک بۆ کەسێک لەناو شوێنی خۆی بێت و سێ شەو و سێ رۆژ بۆ کەسێکی موسافر.

٩ وەکو نموونە لەسەر ئەوە بڕوانە: **الشوكاني، نيل الاوطار، مجلد ١، ص ٥٠٩.** شەوکانی باسی ئەوە دەکات کە گێڕانەوەکانی هەندێک هاوەڵ دژ بە مەسح گێڕانەوەی دروست نین، هەمان سەرچاوە و لاپەڕە. لەلایەکی ترەوە **السقاف**، کە نەیارێکی سەلەفییەتە، دەڵێت کە خیلاف لەناو هاوەڵان هەبووە دەربارەی ئەم مەسەلەیە و قسە لەبارەی ئەو گێڕانەوانە دەکات؛ **السقاف، حسن بن علي، صحيح شرح العقيدة الطحاوية، ط٤، دار الامام الرواس، بيروت، ١٤٢٨-٢٠٠٧، ص ٦٤٣** بەدواوە.

١٠ نەوەکو واشی بۆ بچین کە مەبەستی تەحاوی لە عەقیدە جیاوازی بیروبۆچوونە نەک بیروباوەڕ، تەحاوی لە سەرەتای نامیلکەکەی دەڵێت: ئەمە عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە لەسەر مەزهەبی ئەبو حەنیفە (ناوی دوو قوتابیی ئەویش دەنووسێت) و ئەوەی باوەڕیان پێیەتی سەبارەت بە ئوسووڵی دین **(متن العقيدة الطحاوية، ص٧).** ئوسووڵی دینیش جیاوازییە فیقهییەکان ناگرێتەوە.

١١ **الشوكاني، محمد بن علي بن محمد، نيل الاوطار من اسرار منتقى الاخبار، تحقيق وتعليق ابو معاذ طارق بن عوض، دار ابن القيم، الريلض، دار ابن عفان، القاهرة، ط١، ١٤٢٦-٢٠٠٥، مجلد ١، ص ٥٠٨.**

١٢ **ابن تيمية، الفتوى الحموية الكبرى، مجموع فتاوى شيخ الاسلام احمد بن تيمية، مجلد ٥، مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة، ١٤٢٤-٢٠٠٣، ص ٧٨.**

١٣ **بن باز، عبدالعزيز، تعليقات الشيخ ابن باز على متن العقيدة الطحاوية، نسخة الكترونية، فقرة ٧٦.**

١٤ **الفوزان، الدكتور صالح بن فوزان بن عبدالله، التعليقات المختصرة على متن العقيدة الطحاوية، دار العاصمة، د.ت. ص ١٨٦.**

١٥ **الكليني، محمد بن يعقوب، الاصول من الكافي، دار الكتب الاسلامية، طهران، ١٣٦٥ هجرية شمسية (١٩٨٦م)، مجلد ٢، باب دعائم الاسلام، ح٢.**

١٦ **الكليني، الكافي، مجلد ٢، باب دعائم الاسلام، ح١ و ٣، ص١٨.**

١٧ صەحیحی بوخاری، صەحیحی موسلم، بە چاپی جیاواز.

# دەرکەوتنی ئایینی زەردەشت و
# قەتڵوعامی باپیرانی کورد

**دڵشاد عەزیز زاموا**
ماستەر لە شوێنەوار، خوێندکاری دکتۆرا لە بەشی شوێنەوار لە زانکۆی لایدن لە هۆڵەندا. ژمارەیەک توێژینەوەی بڵاوکراوەی بە زمانەکانی کوردی، عەرەبی و ئینگلیزی هەیە.

## زەردەشت، کەی و لە کوێ لەدایکبووە و لە کوێ ژیاوە؟

تا ئێستا هیچ دەقێکی مێژوویی کۆن و هیچ بەڵگەیەکی شوێنەواری لەبەردەستدا نییە کە پێمان بڵێت زەردەشت کەی لەدایکبووە و لە کوێ ژیاوە. هەرچی لە ئێستادا دەگوترێت تەنها بۆچوون و خەمڵاندن و بە هیچ شێوەیەک ناتوانرێت وەک بەڵگەی مێژوویی پشتیان پێ ببەسترێت[١].

لە سەرەتای سەدەی بیست و گەیشتنی بیری ناسیۆنالیزم بە گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاوە، قسە و باس زۆر خراوەتەڕوو کە زەردەشت لە ئەشکەوتی هەزارمێرد لە چیای بەرانان لەدایک بووە، گۆڕی پیرەمەگرون گۆڕی زەردەشت یان یەکێک لە هاوەڵەکانییەتی. ئەم بۆچوونانە سەرنجراکێشن، بەڵام بێ بەڵگەن و لە ڕووی مێژوویی و شوێنەوارییەوە هیچ بەڵگەیەک نییە پشتگیری ئەم بۆچوونانە بکات.

دەوترێت زەردەشت لە سەدەی شەشەمی پێش مەسیح لەدایکبووە و ژیاوە، بەڵام کەس نازانێت لە کوێ لەدایکبووە. یان دوایی ڕووی کردووەتە کوێ؟ لە کوێ مردووە؟ بەشێوەیەکی گشتیی دەوترێت زەردەشت لە سەدەی شەشەمی پێش مەسیح لەدایکبووە. واتە زەردەشت پێش ڕوخانی دەوڵەتی میدیا لەدایکبووە بەڵام کە ئەو هێشتا مندال بووە کە فارسەکان دەوڵەتی میدیان ڕووخاند و ئیمپراتۆریەتێکی فراوانیان لە ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە بۆ میسر و کەناراوەکانی یۆنان بنیادنا[٢].

## ئایینی میدییەکان

بۆباسکردن لەهەر لایەنێکی شارستانی و مێژووی کۆن دەبێت پشت ببەستین بە بەڵگەی شوێنەواری و بەڵگەی دەقەکۆنەکان، وەک دەقە تۆمارکراوەکان بەخەتی بزماری، هیرۆگلیفی، ئارامی، پەهلەوی،... تاد. لەنووسینە مێخییەکانەوە دەردەکەوێت کە گەلانی کۆنی زاگرۆس هەروەک گەلانی کۆنی میسۆپۆتامیا چەندین خواوەندیان دەپەرست: خۆر، مانگ، ئاسمان، زەوی، ئەستێرە، ڕەشەبا، بروسکە، شاخ، ڕوبار...تاد. ئەم خواوەندانە بە چەندین شێوە پەیکەر و هێمایان بۆ دەکێشرا، لە شێوەی مرۆڤ، ئاژەڵ، یان لە شێوەی مانگ و خۆر و ئەستێرە...تاد، هەر یەکێک لەم خواوەندانە لە هەر ناوچەیەک ناوێکی تایبەتی هەبوو بە پێی زمانی خەڵکی ناوچەکە. تەنها دەقێکی میدی کە جێگەی متمانەبێت، ساختەکراو نەبێت، نووسنی یەکێک لە پاشا میدییەکانە کە لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زایین ژیاوە و ناوی (شیلیسروخ) بوو. ئەم پاشایە لە تۆمارێکی بچوکدا لەسەر تابلۆیەکی برۆنزی بە خەتی بزماری و بە زمانێکی تێکەڵ لە هەردوو شێوەزاری ئاشوری-بابلی باسی ژمارەیەک خواوەند دەکات، شیلیسروخ پاشای شاری ئەبداداني: «با خواوەند عەشتار (ئەستێرەی گەلاوێژ) خاتوونی شارەکە، شاماش (خواوەندی خۆر)،خواوەند بێل-مەتاتی شاهێد بن، پاشا خەوێکی بینیوە...خواوەند عەشتار «دوژمنان ڕابماڵە بەرەوخوار، وەک (لافاوی) ڕوبار، خانوو و تۆویان ڕابماڵە...»[٣].

لە دەقێکی ئاشوریدا، پاشای ئاشوری باس لە داگیرکردنی یەکێک لە هەرێمە میدییەکان دەکات و دەڵێت: هەرێمی (پالیل-ئاندیل-مات)م داگیرکرد. پسپۆڕانی بواری زمانە کۆنەکان ئەم ناوەیان بەم شێوەیە وەرگێڕاوە « خواوەند پالیل سێبەری پارێزەری وڵاتەکەیە».پالیل لە لای سۆمەرییەکان پێی دەوترا نێرگال، خواوەندی جیهانی مردووەکان بوو.

هەروەها تیگلات-پلێسەری پاشای ئاشوری کاتێک هەندێک لە ناوچەکانی میدییەکانی داگیرکرد،

دەڵێت: لەسەر یەکێک لە شاخەکان پەیکەری خواوەند مەردۆخی بابلییەکانی لێبوو منیش قوربانیم بۆ کرد. ئاشورییەکان پەیکەری (خواوەند ئاشور)یان لە مەیدانی هەندێک شارە میدییەکاندا دادەنا.[٤] بەم شێوەیە روون دەبێتەوە کە میدییەکان چەندین خواوەندیان پەرستووە، لەوانەیە ناوی ئەو خواوەندانە بە زمانی میدی جیاوازبووبێت، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی نووسین و بەڵگەی شوێنەواری بۆ پەرستنی ئاهورامەزدا لەبەردەستدا نییە، نە لە پێش دامەزراندنی دەوڵەتی میدیا و نە لەکاتی فەرمانڕەوایی پاشایانی میدیادا. مێژوونووسی یۆنانی هیرۆدۆتس دوای دوو سەدە باسی لە ئایینی فارسەکان کردووە و دەڵێت «نە پەیکەری خواوەندیان هەبوو، نە پەرستگە و نە سەکۆ، بەڵکو بەکارهێنانی ئەمانەیان بە نیشانەی شێتی دادەنا...»[٥].

هەر چەندە ئەم بۆچوونەی هیرۆدۆتس باس لە سەردەمێکی درەنگ دەکات، واتە نزیکەی یەک سەدە لە دوای روخانی دەوڵەتی میدیا بەدەستی فارسەکان، بەڵام پێناچێت بۆچونەکەی راستبێت، چونکە لەو کاتەدا فارسەکان پەرستگە و ئاگردان و پەیکەریان هەبووە. ئەم نووسینەی هیرۆدۆتس زیاتر وەک بەکەم سەیرکردنێکی یۆنانییەکان دەبیندرێت، کە لە جەنگدابوون لەگەڵ فارسەکان کە یەکەم پێکدادانی «رۆژهەڵات» و «رۆژئاوا»بوو لە مێژوودا.

هەروەها پەرستگە میدییەکەی «تەپە نوشیجان» کە هەندێک بە پەرستگەی زەردەشتی ناویاندەبرد، بەڵام لە لایەن هەردوو شوێنەوارناسی بەناوبانگ مایکڵ رۆف و دەیڤید ستروّوناک خۆیان ئەو شوێنەوارە گرنگەیان دۆزیوەتەوە لە کتێبە نوێیەکەیاندا کە هەمووی دەربارەی ئەم پەرستگەیەیە و لە ساڵی ٢٠٠٧ بڵاوکراوەتەوە. باس لەوەدەکەن پەرستگەکە داخراوە و بە بەرد و خۆڵ و خشتی قورین پڕکراوەتەوە. لەو پەرستگەیەدا تەنها شتێک کە ئاماژەیەکی ئایینی هەبوو سەکۆیەکو قاپێک بوو کە پاشماوەی سوتانی پێوەدیاربوو، بەڵام بە بۆچوونی ئەو دوو شوێنەوارناسە ئەو قاپە ناکرێت بەراوردبکرێت بە ئاگردانی زەردەشتی، چونکە تەنکە و بەرگەی ئاگری بەردەوامی نەدەگرد. هەروەها شوێنەوارناسان گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کە پەرستگەکەی نوشیجان پێدەچێت بۆ ژنی یەکێک لە میرە میدییەکان دروستکرابێت کە خەڵکی شوێنێکی تر بووە، ئایینێکی تری هەبووە. بە مردنی ئەو ژنە پەرستگەکە پڕکراوەتەوە[٦].

لە ئەمڕۆدا لێرە و لەوێ دەبیسترێت کە میدییەکان زەردەشتی بوون، پاشایانی میدیا بەتایبەت دیاکۆ و کەیخوسرەو یەکەم زەردەشتی بوون. سەرەتا دەبێت ئەوە روون بکەمەوە کە لە تۆمارە مێژووییەکاندا پاشایەکی میدی نییە ناوی دیاکۆ بێت. بەڵکو دیاکۆ میرێکی ناوچەکانی نێوان بۆکان و شنۆ بوو، لە (دەوڵەتیماننا) لە ساڵی ٧١٤ پ.ز سارگۆنی پاشای ئاشوریبەدیلیگرتیولەگەڵماڵو منداڵەکەیدادوریخستەوەبۆشاری حەما لە سوریا.[٧] دوای نزیکەی دووسەد ساڵ (هیرۆدۆتس)ی مێژوونووس دەڵێت: هۆزە میدییەکان پاشایەکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد ناوی (دایۆکس) بوو. بەڵام ئەم نووسینەی هیرۆدۆتس بناغەیەکی مێژوویی نییە. هیرۆدۆتس دەڵێت: یەکەم کاری دایۆکس دروستکردنی شاری هەمەدان و کۆشکێک بوو کە حەوت شورای هەبوو، هەریەکە و بەرەنگێک رەنگکرابوو.[٨]بەڵام هەروەک وتمان بۆ چوونەکانی هیرۆدۆتس زۆر جێگەی متمانە نین. هەروەها لە دەقێکی ئاشوریدا باس لە چەند بنەماڵەیەکی میدی دەکرێت و لە شوێنێکدا کە دەقەکە بەشێکی شکاوە ناوی بنەماڵەیەک نووسراوە کە جاران هەندێک لە پسپۆڕانی خەتی بزماری بە (بێت-دیاکۆ)

دەیانخوێندەوە، بەڵام دوایی پسپۆڕانی خەتی بزماری و زمانی ئاشوری بۆیان دەرکەوت کە ئەو ناوە نووسراوە (بێت-میدیا) نەک (بێت-دیاکۆ). ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە کەیخوسرەو لە ساڵانی ٦١٤ پ. ز دەرکەوت و کەرکوکی گرت، لە ساڵی ٦١٢ پ. ز دەوڵەتی ئاشوری رووخاند و دەوڵەتی میدیای دامەزراند[٩].کەیخوسرەو لە کۆتاییەکانی ساڵانی ٥٨٠ پ. ز مردووە، واتا پێش لەدایکبوونی زەردەشت! هەروەها (دیاکۆ)یولاتی (ماننا)ش یەکسەدە پێش کەیخوسرە و ژیاوە، ئیتر چۆن بوونە زەردەشتی؟

## یەکەم پاشای زەردەشتی کێ بوو؟

هەرچەندە دەوترێت کە زەردەشت لە سەدەی شەشەمی پێش مەسیح ژیاوە. با بزانین بۆ ئەم بۆچوونە چ بەڵگەیەک هەیە. لە راستیدا هیچ بەڵگەیەکی نووسراو لەبەردەستدا نییە دەربارەی ناوهێنانی زەردەشت لە دەقە مێخییەکاندا، نە لە زاگرۆس، نە لە ئێران و نە لە میسۆپۆتامیا. بەڵکو تەنها ناوی ئاهورامەزدا لە دەقە مێخییەکان (نووسینە بزمارییەکاندا) باسکراوە. ناوهێنانی ئاهورامەزدا وەک تاکە خواوەندێک بۆ یەکەمجار لە مێژوودا لەسەر روی شاخی بێستوون تۆمارکرا لەساڵی ٥٢٢ی پێش مەسیح، واتە ٢٨ ساڵ دوای رووخانی دەوڵەتی میدیا بەدەستی فارسە هاخامەنشییەکان. ئەم نووسینە لە لایەن پاشای هاخامەنشی داریوشی یەکەم (٥٢٢-٤٨٦ پ.ز) تۆمارکراوە، بابزانین داریوش بۆ چ یادگارییەک ئەم نووسینەی تۆمارکرد.

## راپەڕینەکەی هەمەدان و هەولێر

هەروەک باسمانکرد کۆرشی فارسی هاخامەنشی لە ساڵی ٥٥٠ پ. ز دەوڵەتی میدیای رووخاند و دەوڵەتی فارسی دامەزراند[١٠]. دوای ٢٨ ساڵ لە فەرمانڕەوایی فارسە هاخامەنشییەکان بەسەر گەلانی کۆنی ئەم ناوچەیەدا، لە (بەهاری-نەورۆزی) ساڵی ٥٢٢ پ. ز هەموو گەلان دژی فارسەکان راپەڕین. لە زاگرۆس نەوەکانی پاشایانی میدیا لە هەمەدان و لە هەولێر سەرپەرشتی ئەم راپەڕینەیانکرد. بەڵام ئەم راپەڕینانەش لایەن داریوشی یەکەمی فارسی هەموویان سەرکوتکران.

## قەتڵوعامی نەوەکانی کەیخوسرەو لە شاری هەمەدان و ئەربێلا

داریوشی فارسی دامرکاندنەوەی ئەم راپەڕینانە و سەرکەوتنی خۆی لەشاخی بێستون تۆمارکرد. لە دیمەنێکدا کە لە شاخی بێستون هەڵکەندراوە، خۆی وەک سەرکەوتوو، پاشای وڵاتانیش بە کۆتکراوی دەردەکەون لەبەردەمیدا. داریوش سەرکەوتنەکانی بەسەر دوژمنەکانیدا بە هەر سێ زمانی فارسی کۆن،ئیلامی، بابلی و بە هەردوو خەتی ئارامی و خەتی مێخی تۆمارکردن. لە نووسینەکاندا داریوش دەڵێت: ئەم سەرکەوتنانەم بە یارمەتی ئاهورامەزدا و بە هیمەتی ئەو بەدەستهێناوە، سوپاس و ستایشی بۆ ئاهورامەزدا راگەیاند. بەڵێ ئەمە کۆنترین ناوهێنانی ئاهورامەزدایە لە مێژوودا، داریوشی فارسی، یەکەم کەس بوو کە ناوی ئاهورامەزدای هێناوە، ئەگەر ئاهورامەزدا گەورەترین خواوەند یان رۆحی پیرۆزی زەردەشتی بێت، کەواتە بە پێی نووسینەکانی شاخی بێستون دەبێت پاشا داریوشی فارسی لەوانەیە یەکەم زەردەشتی بووبێت لەدوای زەردەشت خۆی!

بابێینە سەر نووسینەکەی شاخی بێستون و بزانین داریوشی فارسی چی دەڵێت: «من داریوس، پاشاکە، کوڕی هایستاسپیس، هاخامەنشیەکم (ئەخمینیەکم)، پاشای پاشاکانم، فارسێکم، پاشای وڵاتی فارسم». پاشان باسی ئەوەدەکات کە باوکی و بنەماڵەکەی پیاوماقوڵ و میری فارسەکان بوون.

**هیچ ئاماژەیەکی نووسین و بەڵگەی شوێنەواری بۆ پەرستنی ئاهورامەزدا لەبەردەستدا نییە، نە لە پێش دامەزراندنی دەوڵەتی میدیا و نە لەکاتی فەرمانڕەوایی پاشایانی میدیادا.**

لە برگەی پێنجەمدا پاشا داریوس دەڵێت:»لە ژێر پارێزگاری ئاهورامەزدادا من پاشام. ئاهورامەزدا پاشایەتی پێداوم»[11].

### بەهارە خوێناوییەکەی هەمەدان

لە برگەی ٢٥ دا داریوش دەڵێت: "بەرەو میدیا بەڕێکەوتم. کە گەیشتمە میدیا، لە شاری کوندور، فەراڤەرتیش وتی:من خەشاتریتتی (پاشا)م، نەوەی کەیئەخساریس(کەیخوسرەو)م، پاشاکەی میدیا، لەگەڵ من شەڕی کرد، لە جەنگێکدا بە یارمەتی ئاهورامەزدا کە پشت و پەنام بوو. لە ژێر چاودێری ئاهورامەزدادا، سوپاکەی فەراڤەرتیشم بەزاند. لە ٢٥ی نیسانی ساڵی ٥٢٢ پ. ز ئەو شەڕەمان کرد. سی و چوارهەزار و چوارسەد و بیست و پێنج (میدی)م لێکوشتن، هەروەها دیلەکانیان لە ژمارە نەدەهاتن. پاشان فەراڤەرتیش لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە سەربازەکانیدا بە سواری ئەسپێک هەڵهات، چوو بۆ شاری رەگا لە میدیا. سوپام بۆ ناردن. لەگەڵ سەربازەکانی، فەراڤەرتیشان گرت و هێنایانن بۆم. لوتیم بری،هەروەها هەردوو گوێچکەکانی، زمانی، یەک چاویم کوێرکرد. هەڵمواسی بە دەروازەکەمەوە. بۆ ئەوەی هەموو خەڵک ببینێت. پاشان تێلاترێنم کرد(کۆڵەکەم تێبری) لە شاری ئێکباتانا (هەمەدان). چل و حەوت پیاوماقوڵی شاری ئێکباتانام سەربڕی، سەرەکانیانم بە قولەکانی شورای شارەوە هەڵواسی»[21].

### دامرکاندنەوەی راپەڕینەکەی شاری ئەربێلا و کوشتنی نەوەکانی کەیخوسرەو

برگەی ٢٦ لە نووسینەکەی شاخی بێستون: «شیترانتەخما، (لە هۆزی) سەگارتییەکان، راپەڕی و بە خەڵکی دەوت: من پاشام، نەوەی کەیئەخسار(کەیخوسرەو)م. پاشان سوپایەکم لە میدی و فارسەکان بۆ نارد. تەخماسپەدە، خزمەتکارم، کە میدییەک بوو، کردم بە سەرکردەی ئەو سوپایە. فەرمانم پێکردن و وتم: برۆن، برۆن و راپەڕیوەکان ببەزێنن ئەوانەی کە گوێڕایەڵم نین». تەخماسپەدە بە سوپاوە بەڕێکەوتن. لە جەنگێکدا کە ئاهورامەزدا پشتگیرم بوو. لە ژێر پارێزگاری ئاهورامەزدادا سوپاکەم، راپەڕیوەکانیان بەزاند. لە رۆژی ٥ی تشریتو (تشرین) جەنگەکەیان کرد. شیترانتەخمایان بەدیگرت و بۆ منیان هێنا. لوتیم بری، هەردوو گوێچکەکانی، زمانی، یەک چاویم کوێرکرد. بە دەروازەکەمدا هەڵمواسی. هەموو خەڵک دەیانتوانی ببینن. پاشان لە شاری ئەربێلا تێلاترێنم کرد. راپەڕیوە (یاخیبوو)ەکان، کوژراو و رزگاربووەکانیان چوارسەد و چل و حەوت کەس بوون»[31].

هەروەک داریوش بۆمان دەگێڕێتەوە، هەردوو شازادە میدییەکەی نەوەی کەیخوسرەو دوای لوت و گوێ و زمان برین و (چاو)ێک کوێرکردنیان هەڵواسراون، پاشان تێلاترێن کراون. ئەو زەمانە سێدارە و لەخاچدان نەبوو، بەڵکو «تێلاترێن» هەبوو، کە ئاشورییەکان دایانهێنابوو. داریوش ئەم کردەوەیەی لە ئاشورییەکانەوە وەرگرتبوو. دیلەکان رووت دەکرانەوە، کۆڵەکەیەک کە سەرێکی باریک و تیژی هەبوو، لە (کۆم)ی هەر دیلێک دەچەقێندرا و یان لە سکی دەچەقێندرا، پاشان

## کەیخوسرەو پێش لەدایکبوونی زەردەشت مردووە، ئیتر چۆن کەیخوسرە بووە بە زەردەشتی؟!

کۆڵەکەکە لەبەردەم دەروازەی شار لە زەویدا دادەچەقەنێندرا، بۆ ماوەی رۆژێک یان زیاتر بەو ئازاراوە دیلەکان خوێنیان لێ دەچۆڕا هەتا دەمردن.

داریوشی فارس، بەم شێوەیە کۆتایی بە بنەماڵەی میدیا و کەیخوسرەو هێناوە و قەتڵوعامی کردوون، داریوش لە نووسینەکانی شاخی بێستون دەڵێت: «ئەم سەرکەوتنانەم بە ناو و یارمەتی ئاهورامەزدا ئەنجامداوە، ئاهورامەزدا هەڵیبژاردوم بۆ پاشایەتی». بەم شێوەیە بۆ خوێنەری بەرێز رووندەبێتەوە کە میدییەکان نەک هەر ئاهورامەزداپەرست نەبوون، بەڵکو بوونە قوربانی یەکەم دەرکەوتنی ئاهورامەزدا. میدییەکان لەژێر ناوی ئاهورامەزدادا قەتڵوعام کراون، دەسەڵات و دەوڵەتیان تیاچوو، نەوەکانی میدیا و کەیخوسرەو بە قێزەونترین شێوە کوژران، تەنها ئەو میدیانە لە دەرباری کۆشکی فارس و دین و دەوڵەتدا مانەوە کە ملکەچی فارسیان قبوڵکرد.

### دزینی ئایینی زەردەشتی و پیری موغەکان

هەندێک کەس کە وەک نووسەری تۆرە کۆمەڵایەتییەکان دەردەکەون و بەرهەمی نووسراویان نییە، بە خوێنەرانیان دەڵێن کەوا داریوشی فارس زەردەشتی لە میدییەکان دزیوە، بەتایبەت لە پیری موغان؟! ئەم باسە کە بۆ یەکەم جار دێتە بەرگوێیان، هەر وەک باسی شیعە و عەلی و قورئان دزینەکە وایە کە شیعە دەڵێن قورئان بۆ عەلی هاتبوو. بەڵام با بزانین موغ کێ بوون؟ ئایا عەشیرەت بوون یان پیاوی ئایینی؟ ئایا میدی بوون یان فارسی؟

دەگوترێت (پیری موغان) میدی بوو، داریوش کوشتی. بەڵام بە گەڕانەوە بۆ نووسینەکەی شاخی بێستون دەبینین داریوش دەڵێت (بارزییا) کوڕی کۆرشی فارس بووە. هەروەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، کۆرشیەکەم پاشای فارس و دامەزرێنەری دەوڵەتی فارسی هاخەمەنشی و رووخێنەری دەوڵەتی میدیابوو. داریوش دەڵێت بارزیا لەلایەن برا گەورەکەیەوە کوژرا، برا گەورەکەی پاشا قەمبیز (کامبیس)پپاشای فارس بوو. داریوش دەڵێت پاش ئەوە یەکێکی دیکە لە بنەماڵەی میدییەکان وتی من بارزیام و نەمردووم. داریوش بەم کەسە دەڵێت درۆزن، دەڵێت ئەو بارزیا نەبوو بەڵکو ناوی (گاوماتا) بووە لە بنەماڵەی ماگوش بووە. داریوش ئەم کەسە دەکوژێت. هەرچەندە هیچ سەرچاوەی دیکە لەبەردەستتدا نییە کە بزانین داخۆ ئەم کەسە هەمان شازادەی فارس بارزیای کوڕی کۆرش بووە، یان ناوی (گاوماتا) بووە و لە بنەماڵەی عەشیرەتی ماگوش بووە. هەروەها هیچ ئاماژەیەکی مێژوویی نییە دەربارەی ئەم بنەماڵەیە کە بنەماڵەیەکی ئایینی بووبن. ناشزاندرێت کە چ پەیوەندییەکی بە پلەی موغی زەردەشتییەوە هەیە کە لە دواتردا دەردەکەوێت[٤١]. ئیتر ئەو قسە و باس و حەکایەت گێڕانەوەیەی کە دەربارەی پیری موغان و راپەڕین دەکرێت بناغەیەکی راستی نییە، میدییەکان دوو شازادەی ناوداری خۆیان هەبوو کە سەرپەرشتی ئەو راپەڕینەیان کرد، فراڤەرتیس لە هەمەدان و شتیرانتەخما لە ئەربێلا (هەولێر)،هەردووکیان داریوشي فارس کوشتني.

بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە باردیا هەر فارس بووە و لە بنەماڵەی موغەکان بووە. موغەکان عەشیرەت بوون، نەک پیاوی ئایینی. جا تەنها شتێک لێرەدا جێی ئاماژەیە ئەوەیە باردیا هانای بردبوو بۆ

وێنەی دوو جێ مۆری ئاشوری کە لە شاری نەمرود دۆزراونەتەوە و لە وێنەی یەکەمدا دوو کەسی ئاشوری سڵاو لە هێمای خواوەند ئاشور یان خواوەند شاماش دەکەن. لەوێنەی دووەمدا کەسێک لەبەردەم ئاگردانێکدا خواوەند عەشتاری ئەربێلا دەپەرستێت. هەردوو مۆرەکە بۆ سەدەی حەوتەمی پێش مەسیح دەگەڕێنەوە کە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوری بوو[٥١].

میدییەکان لە هەمەدان. بەم شێوەیە روون دەبێتەوە کە موغەکان عەشیرەت بوون نەک پیاوی ئایینی. ئەگەر لەدواتردا پیاوانی ئەم بنەماڵەیە بووبێتنە پیاوی ئایینی ئەوە شتێکی ئاسایی بووە، بەو شێوەیە بنەماڵەی داریوشی فارس دەسەڵاتیان بۆ خۆیان قۆرخکردووە و رێورەسمە ئایینییەکانیشیان داوەتە ئەم بنەماڵەیە. ئەمە لە بارێکدا ئەگەر قبوڵمانکرد کە موغی زەردەشتی پەیوەندی بە ناوی ئەم عەشیرەتەوە هەبوبێت.بەڵام لە هەموو بارەکاندا (بارزیا) کە سەر بە بنەماڵەی موغی بووە، میدی نەبووە. بەڵکو فارس بووە. باردیا کورە بچوکی کۆرشی فارسی بوو. ئەو کۆرشەی دەوڵەتی میدیای روخاند.ئیتر چۆن بوو بە میدی!

## شوێنەوار و پاشماوە زەردەشتییەکان لە کوردستان

فەرەوەهەر کە بە هێمای ئاهورامەزدا دەناسێندرێت، لە بنەڕەتدا هێمای خواوەندی خۆری میسرییە و پاشان میتانییەکان ئەم هێمایەیان بەکارهێنا وەک هێمای خواوەندی خۆر. لە لای میسری و میتانییەکان هێماکە تەنها کەوانەیەک بوو دوو باڵی پێوەبوو، بەڵام دواتر کە ئاشورییەکان ئەم هێمایەیان لە میتانییەکان وەرگرت، ئیتر لە نێو دوو باڵ و بازنەکە مایەوە، بەڵام لە نێو بازنەکەدا هێمای خواوەندێکی شێوە مرۆڤ دەردەکەوت کە دەستی بەرزکردووەتەوە بۆ سڵاو. ئەم هێمایە کتومت لە لایەن داریوشی فارسەوە لە ئاشورییەکانەوە وەرگیراو لە شاخی بێستون هەڵکەندراوە. ئەم هێمایەی کە ئێستا زەردەشتییەکان کردویانەتە هێما و وەک خاچی مەسیحیان لە مل دەکرێت، هێمای خواوەندی خۆر و خواوەند ئاشوری ئاشورییەکانە. فارسەکان بە چەندین شێوە وێنەی ئەم هێمایەیان کێشاوە، بەڵام لە زۆربەی وێنەکاندا هەر هەمان دیمەنی هێما ئاشورییەکەیە دووبارەدەبێتەوە. ئەو سڵاوکردنەش لە راستیدا خواوەندە سڵاودەکات نەک ئەوانەی دەیپەرستن، پاشا داریوش کە دەستی بەرزکردووەتەوە بەرەو رووی ئەم هێمایە لە شاخی بێستون بە هیچ شێوەیەک ئاماژەی سڵاونییە، بەڵکو ئەو دوو پەنجەی بەرزکردووەتەوە وەک هێمایەک

بۆ سەرکەوتن، ئەو دوو پەنجە بەرزکردنەوەیەش کۆنترین هێمای سەرکەوتنە لە مێژوودا، بەڵام چ سەرکەوتنێک، سەرکەوتن بە خوێنی زیاتر لە ٣٠ هەزار میدی راپەڕیو دژی دەسەڵاتی فارس.

## ئاگرپەرستی پێش زەردەشتی

زەردەشتییەکان بە ئاگرپەرست ناودەبرێن، هەرچەندە لەوانەیە بە وردبوونەوە و چونە قوڵایی دین و دەقەکانەوە ئەم ناونانە زیاتر ناتۆرەبێت. بەڵام ئاگرپەرستی لە میسۆپۆتامیای کۆن هەبووە و خواوەند (گرو) خواوەندی ئاگربووە، پێدەچێت وشەی کوردی (گڕ) هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت. بەکارهێنانی ئاگر لە رێوڕەسمە ئایینیەکانی میسۆپۆتامیا و زاگرۆسدا پێش زەردەشتی مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە و لە ئێستادا ناکرێت باسی بکەین و توێژینەوەیەکی تایبەتم بە ئینگلیزی لەو بارەوە ئامادەکردووە[٦١].

## گۆڕەکەی قزقاپان هی کێیە؟

زیاتر لە سەدەیەکە توێژینەوە لە گۆڕی قزقاپان دەکرێت، هەر لە ئەدمۆنزی ئینگلیزەوە بۆ شوێنەوارناسە ئەڵمانی، فارس و کوردەکان. بۆچوونی جیاواز هەیە دەربارەی ئەم گۆڕە و سەردەمەکەی. هەندێک بە میدی، یان سەردەمی هاخامەنشی فارسی، تەنانەت هەندێک بە هی سەردەمی یۆنانی-هلینستی، یان ئەشکانی دادەنێن. هەر یەکە و بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە. بەڵام لەبەر نەبوونی نووسین، یان فەوتانی نووسینەکە، بە هیچ شێوەیەک ناتوانرێت بزانرێت ئەوانە گۆڕی کێ بوون. راستە سێ ژوور هەیە، هەریەکەیان گۆڕێکی تێدا هەڵکەندراوە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەوانە پاشاکانی میدیا بوون. بە شێوەیەکی گشتیی دەتوانرێت تەمەنی قزقاپان بە کۆتایی سەدەی شەشەم یان سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح دیاریبکرێت، ئەو سەردەمەش سەردەمی فەرمانڕەوایی فارسەکان بووە، بەتایبەت سەردەمی داریوشی یەکەم، ئەو پاشا فارسەی کە لە ساڵی ٥٢٢ پێش مەسیح ئەوکاتە هەرێمەکانی دابەشکردبوو، هەرێمی میدیا ساترابێکی هەبوو. لە شوێنی دەریاچەی دوکان شوێنەواری گردە دێم هەبوو، کە لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی رابردوو پشکنینی تێداکرا[٧١]. لەم گردە کۆشکێکی سەردەمی دەسەڵاتی هاخامەنشی دۆزرایەوە،پێدەچێت ئەو میرە نێژراوانەی ئەم گۆڕەی قزقاپان میری ئەو کۆشکە بووبن، بەڵام نازانرێت کە ئایا خەڵکی ناوچەکەبوون یان نا.

لە دوای روخانی دەوڵەتی هاخامەنشی فارسی، لەگەڵ هاتنی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) یش لە ساڵی ٣٣١ پێش مەسیح، بۆ زیاتر لە دوو سەدە زەردەشتی تروسکایی لێبڕابوو. زۆربەمان لە قوتابخانە، مامۆستای کوردی چیرۆکی یەکەم ئاوێستای بۆگێڕاوینەتەوە، کە (لەسەر پێستی ١٢ هەزار گامێش و بە ئاوی زێڕ نووسراوبووەوە، ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ساڵی ٣٣١ پێش مەسیح سوتاندوویەتی و لەناوی بردووە). هەرچەندە ئەمەش هەر چیرۆک بوو، راستەییەکە ئەوەبوو کە یۆنانییەکان هاتن ئایین و جلوبەرگ و زمانی خۆیان بڵاوکردەوە و سەرکەوتووبوون. بەو شێوەیە لەم سەردەمدا زەردەشتی تروسکایی لێبڕابوو. تا هەندێک لە پاشایانی ئەشکانی، لەدوای وەدەرنانی یۆنانییەکان، هەوڵیاندا وەک کەلەپوورێک زەردەشتی زیندوبکەنەوە، مەبەستەکەش زیاتر ئەوەبوو کە لە جەنگدابوون لەگەڵ یۆنانی، پاشان لەگەڵ رۆمەکان، ئەو دوو شارستانییەتەش بەخۆیان و دابونەریت و شارستانییەتییانەوە هەموو رۆژهەڵاتیان داپۆشیبوو، تەنانەت جلوبەرگ و ناوی

**ئەم هێمایەی کە ئێستا زەردەشتییەکان کردویانەتە هێما و وەك خاچی مەسیحیان لە مل دەکرێت، هێمای خواوەندی خۆر و خواوەند ئاشوری ئاشورییەکانە.**

کەسەکانیش هەمووی کرابوونە یۆنانی. لەگەڵ ئەم زیندووکردنەوەیەدا، میترا و ئاهیتاپەرستیش تێکەڵی ئاهورامەزداپەرستی کرا. شوێنەوارناس و ئێرانناسی بەناوبانگ (ئێرنست هێرزفیلد) لە کتێبێکی دوو بەرگیدا بەناوی وشەکانی زەردەشت زۆر بەوردی باس لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم ئایینە دەکات. هەروەها باس لەو خواوەندانە دەکات کە لە پێش زەردەشتیدا هەبوون، بەڵام دواتر لە لایەن زەردەشتییەکانەوە تێکەڵ بە ئاهورامەزداپەرستی کراون. بۆ نموونە دەڵێت میترا خواوەندێکی پێش زەردەشتییە، خواوەندی فەرمانە کۆمەڵایەتییەکان بوو، زەردەشت بناغەی ڕێساکانی لەسەر یەشتی میترا دارشتووە و بناغەی ئاهورامەزداپەرستی لە میتراپەرستییەوە وەرگرتووە[٨١]. ئاناهیتا خواوەندێکی ژن بوو «خاتوونی ئاژەڵەکان» بە ئاوی ئاسمانی و فەڕ و بە پیتی دادەندرا.لە لایەن زەردەشتەوە پەرستنی ئەم خواوەندە ڕەتکرایەوە، بەڵام کوڕەکەی داریوشی فارس کە بووە پاشا، ئاناهیتاپەرستی تێکەڵ بە زەردەشتی کرد. ڕێزگرتن لە ئاژەڵان لە نێو زەردەشتیدا بەتایبەت سەگ پەیوەندی بەم ئاناهیتایەوە هەیە[٩١]. هۆما خواوەندێکی پێش زەردەشتی بوو وەک خواوەندی دایۆنیسی یۆنانی کە خواوەندی شەراب بوو[٠٢].

تێکەڵکردنی میتراپەرستی بە ئاهورامەزداپەرستی لە شێوە ساسانییەکەیدا لەژێر کاریگەری ڕۆمەکان بووە. چونکە لەم سەردەمەدا لە ناو ڕۆمەکاندا و بەتایبەت لە ناو سوپای ڕۆمدا میتراپەرستی تەشەنەی کردبوو. چەندین پەرستگەی میترایی لە ژێر زەوی لە ناو شارە ڕۆمانییەکان دروستکران، تەنانەت باشترین نموونەکانی پەرستگەی میترایی پەرستگەکانی میتران لە شاری ڕۆما. هەروەها میترایی کاریگەری لەسەر نووسینەوەی چیرۆکی لەدایکبوونی مەسیح هەبووە، بەتایبەت کە لە هەندێک لە مەزهەبە مەسیحییەکاندا کۆتایی مانگی دیسەمبەر وەک لەدایکبوونی مەسیح دادەندرێت لە لایەن هەندێک لە مێژوونووسانەوە بەراورکراوە بە سەرهەڵدانەوەی میترا لە کۆتایی دیسەمبەردا.

کێشمەکێشمی ئەشکانی و یۆنانی، پاشان ئەشکانی و ڕۆمانی و دواتریش ساسانی و بیزەنتی، کاولکارییەکی زۆری بەدوای خۆیداهێنا لە ناوچەکانی کوردستان، بەتایبەت کوردستانی باشوور. چونکە شوێنی بەریەککەوتنی ئەو دوو ئیمپراتۆرییەتەبوون، پاشان هەردوو ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی و ساسانی کەوتنە کوشت و بڕی شوێنەکەوتووەکانی ئایینی ئیمپراتۆرییەتەکانیان، لەمەشدا کوردانی ژێردەستی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کە زۆرینەی کوردستانی دەگرتەوە بەشێکی زۆری کوردستانی باشوور، هەموو کوردستانی باکور و ڕۆژئاوا کە زۆرینە مەسیحی بوون هەر کاتێک ساسانییەکان هێرشیان بهێنایە ئەوان یەکەم قوربانی بوون. بەهەمان شێوە زەردەشتییەکانیش لە هەندێک بەشی کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکەوتنە بەرچەوساندنەوەی بیزەنتییە مەسیحییەکان.

لەوانەیە باشترین نموونەی ئەم جەنگ و کێشمە کێشمە لە شوێنەوارەکەی دەربەندی بازیاندا بەڕوونی ببینین. ئەم شوێنەوارەی دەربەندی بازیان کە لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی

رابردوو لە لایەن چەند شوێنەوارناسێکی کوردەوە هەڵکۆڵینی شوێنەواری تێدا ئەنجامدرا، چەندین رەگەزی بیناسازی گرنگی دەرخست. قەڵایەکی تۆکمە کە دیوارەکانی دەرەوەی زۆر ئەستورن. چەندین قوللەی بەهێزی هەیە. بە بەرد و قسڵ دروستکراوە (کە یەکێکە لە کەرەستە سەرەکییەکانی بیناسازی لە کوردستاندا لە سەردەمی ساسانییەکاندا). لە ناوەڕاستی ئەم قەڵا بەهێزەدا چوارتاقێک بەرچاو دەکەوێت کە پاشماوەی کۆڵەکە بازنییەی ئەستورەکانی ماوەتەوە و لە ناوەڕاستیدا سەکۆیەک دەبیندرێت. لە کاتی دۆزینەوەی ئەم سەکۆیەدا، وێنەی ئەم پاشماوە بیناسازییانە گیراون و لە ئەرشیفی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی پارێزراون. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، ئەم چوارتاقە لەدواییدا دەستکاری کراوە بە شێوەیەک بۆ ئەوەی لە کەنیسەی بازلیکی بچێت، کە جۆرێک لە کەنیسەی کۆنە و لە سەردەمی ساسانییەکان لە ناوچەکانی میسۆپۆتامیا هەبوون. ئەم ساختەکردنە بە مەبەستبووە، قسەوباس زۆرن کە لێرەدا جێگەی باسکردنی نییە. بەڵام ئەوەی کە حاشا هەڵنەگرە ئەوەیە کە لەم شوێنەوارەدا چەندین پاشماوەی خاچ دۆزراونەتەوە، خاچەکان لە گەچ دروستکراون و بە رەنگی سور و رەش رەنگکراون. ئەوانەی کە پێیان وایە کەنیسەیە، ئەم خاچانە دەکەنە بەڵگە، بەڵام لە راستیدا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ رووداوە مێژووییەکان دەبینین کە لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی ساسانیدا، ساسانییەکان لە جەنگێکی سەختدابوون لەگەڵ بێزەنتییەکان و جەنگی ساڵی ٦٢٨ زاینی تێیدا ساسانییەکان خراپ تێکشکان و رۆمە بێزەنتییەکان گەیشتنە دەشتی شارەزور، جا لەوانەیە ئەم خاچانە هی سەربازە رۆمە مەسیحییەکان بێت و لەکاتی دەستبەسەراگرتنی ئەم قەڵا و ئاتەشگەدەیەدا لەگەڵ خۆیان هێنابێت بۆ ئەو شوێنە. شایەنی باسە دواتر ئەم شوێنەوارە وەک قەڵایەک بۆ چاودێری رێگەی بازرگانی نێوان کەرکوک و ناوچە شاخاوییەکان بەکارهێنراوە، لە سەردەمی عەباسییەکاندا چەند جارێک نۆژەنکراوەتەوە.

پەرستگەی چوارستین لە نزیک دهۆک، یەکێکە لە پەرستگە زەردەشتییەکان و لە ناو شاخەکەدا هەڵکەندراوە. بەڵام شوێنەوارەکەی دەربەندیخان خانێکی کۆنە و پەرستگەی زەردەشتی نەبووە، لە ساڵی ٢٠٠٩ ئەو تیمەی ئەو شوێنەوارەیان نۆژەندەکردەوە کارەکانیان پێ راگیرا لە لایەن لیژنەیەکی پسپۆڕ لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی شوێنەوار، چونکە خانە کۆنەکەیان بە چیمەنتۆ نۆژەنکردبووەوە، هەروەها بە پشتبەستن بە شێوازی شوێنەوارێکی ئێرانی لەخۆڕا گومەز و بەشی بۆ زیادکرابوو[١٢].

قەڵای بازیان و پەرستگە زەردەشتییەکە
(فۆتۆی نووسەر ٢٠٠٥).

ئەم شوێنەوارانە پاشماوەیەکی شارستانی کۆنی کوردستانن، موڵکی هەموو مرۆڤایەتین و بەتەنیا هیچ گروپ و لایەنێک ناکرێت خۆی بکات بە خاوەنی. بە بەراورد بەو ماوە زۆرەی دەسەڵاتی ئەشکانی و ساسانی لە زۆرێک لە ناوچەکانی رۆژهەڵات و باشوری کوردستاندا، پاشماوەی زەردەشتییەکان کەمن. ئەم کەمییەش هیچ پەیوەندی بە تێکدان و

فەوتانەوە نییە. چونکە ئەگەر تێکیشدرابن ئەوە پاشماوەکانیان هەر دەمایەوە. ئەوەتا شوێنەواری پەیکوڵی پاشای ساسانی نەرسە لە گەرمیان هەموو بەردە نووسراوەکانیشی ماون و لەدوای راپەڕین هێندرانە مۆزەخانەی سلێمانی.

## کۆنترین یەکتاپەرستی لە کوردستان

ئایینی زەردەشتی پێدەچێت لەسەرەتادا یەکتاپەرستییەکی پوخت بووبێت، بەڵام دواتر کەم تازۆر دوانەیی (Dualism) خێر و شەڕ کەمێک گۆڕانکاری بەسەردا هێناوە[٢٢]. دیمەنی نەخشە هەڵکەندراوەکانی پاشایانی ساسانی لەتاق وەسان لە بەردەم پەیکەری خواوەندانی ئاهورامەزدا، میرا و ئاناهیتادا ئەوەمان پێدەڵێت کە لە سەردەمی ساسانیدا زەردەشتییەت لەبەرگە راستەقینەکەی خۆیدا نەماوە، بەڵکو لە دوانەییش تێپەڕیوە. ئاهورامەزدا، میترا و ئاناهیتا وەک مرۆڤ وێنەکێشراون و وەک پاشایانی ساسانی یان بەسواری ئەسپن یان رووبەڕوو بەیەکتر دەگەن. ئەم دیمەنانە هێنانەخوارەوەی شکۆی خواوەندەکان بۆ شکۆی پاشای ساسانی و بەرزکردنەوەی شکۆی پاشا بۆ شکۆی خواوەندەکانمان نیشان دەدەن. میترا یەکێک بووە لە خواوەندە کۆنەکانی ئارییەکان، نزیکەی هەزارساڵ پێش زەردەشتی دەرکەوتووە. بەڵام ئەو میتراپەرستییەی ساسانییەکان لە رۆمەکانەوە وەریانگرتبوو دوای ئەوەی میتراپەرستی ناو رۆمەکان بە خێرایی تەشەنەی کرد.

کۆنترین یەکتاپەرستی لە مێژووی کۆنی کوردستاندا پێدەچێت پێغەمبەر ئیبراهیم بووبێت. ئەو هەرچەندە بابلی یان سۆمەری بووە، بەڵام بە کوردستاندا کۆچی کردووە بۆ فەلەستین و میسر و حیجاز. دەگوترێت لە حەڕان لەدایک بووە و لەشاری ئورفە چەند ئەشکەوت و شوێنەوار بەناوی شوێنی لەدایکبوونی ئیبراهیم و شوێنی مەنجەنیق و چەندین چیرۆک بۆ ئەو شوێنەوارانە دروستکراونکەجێگەیمتمانەنین،بەڵاموەک دەق تەنها ئاماژەیەکی تەلمودی جولەکەکان هەیە کە ئیبراهیم حەوت ساڵ لە کوردستان ژیابێت[٣٢]. هەندێک لە مێژوونووسەکانی کوردستانیش لەسەدەی رابردوو دەیانوت حەزرەتی ئیبراهیم زەردەشتی یەکەمە، زەردەشت زەردەشتی دووەمە. جا ئەوان لەوانەیە هەر مەبەستیان لە یەکتاپەرستییەکە بووبێت.

بەڵام پێش لەدایکبوونی زەردەشت و بڵاوبوونەوەی ئایینەکەی لە کوردستان، بەتایبەت لە وڵاتی میدیا، جولەکەکانی دەوڵەتی ئیسرائیل بەتایبەت جولەکەی شاری سامرە (سامری) لەلایەنئاشورییەکانەوەراگوێزران بۆ وڵاتی ماد لە ساڵی ٧١٥ پ.ز واتە زیاتر لە یەک سەدە و نیو پێش دەرکەوتنی زەردەشت. ئایینی جولەکە لە نێو گەلانی زاگرۆسدا بڵاوبووەوە و باشترین نموونە بنەماڵەی فەرمانڕەوای ئەدیابین بوو. شانشینی ئەدیابین کە ناوچەیەکی بەرفراوانی باشووری کوردستانی لەبندەستدابوو، لە روباری دیجلەوە بۆ زێی خواروو و هەندێک کات فراوانتریش بوو، لە سەردەمی شاژنە هێلینا و ئازاتی کوڕیدا هەردووک لە هەولێر بوونە جو، هەرچەندە خەڵکەکە قبوڵیان نەکردن و ئەوانیش شاری ئەربێلا (هەولێر)ی پایتەختی ئەدیابینیان بەجێهێشت و رویان لە ئورشەلیم کرد[٤٢]. لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی و دەسەڵاتی بێزەنتییەکان، زۆربەی ناوچەکان لە کەرکوکەوە بۆ کورستانی باکور و رۆئاوای کوردستان بوونە مەسیحی، هەروەک ئێستا دەبینین کە کوردە مەسیحییەکان لە زۆرێک لە شار و شارۆچکەکانی کوردستان بەردەوامییان بە باوەڕی خۆیان داوە. جولەکەکانیش بەهەمان شێوە هەتا لە ساڵی ١٩٤٨ بەکۆمەڵ کۆچیان کرد بۆ فەلەستین.

بەشێکی بەرچاوی خەڵکی کوردستان لە سەردەمی ساسانییەکاندا مەسیحی بوون، دوای

هاتنی ئیسلامیش بەشێکیان هەتا ئێستا پێڕەوی ئایینی خۆیان دەکەن و هەر مەسیحین. لە ئەدەبیاتی مەسیحییەکانی کوردستاندا مار بەهنام (بەنام) و مار شیرین ئەو خوشک و برایەی کە دەگوترێت شازادەی ساسانی بوون و نەوەی شاپور بوون، دوای ئەوەی بوونەتە مەسیحی لەلایەن ساسانییە زەردەشتییەکانەوە کوژراون. مار قەرەداغ کە ئەوی خەڵکی ئەم قەرەداغە بووە و پلەوپایەی سەربازی و ئیداری هەبووە لە ناو دەوڵەتی ساسانیدا، لە ڕێگەی مەسیحییەکانی کوردستانەوە بووەتە مەسیحی و پاشان کوژراوە. هەرچەندە ئەم دەقە ئەدەبییە مەسیحیانە زۆر وردەکاری مێژوویی تێدانییە، بەڵام ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە مەسیحییەکانی کوردستان توشی چەوساندنەوە بوون لە ژێر دەسەڵاتی هەندێک لە پاشایانی ساسانیدا، بەتایبەت شاپور. بەهەمان شێوەش زەردەشتییەکانی ژێردەسەڵاتی ڕۆمە بێزەنتییەکان[٥٢].

## دەرئەنجام

دەرئەنجام لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بەڵگەی مێژوویی و شوێنەواری لەبەردەستدا نییە دەربارەی ژیان و شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت. هەروەها هیچ بەڵگەیەک لەبەردەستدا نییە کە بیسەلمێنێت پاشایانی میدی زەردەشتی بوون. بەڵکو لەدوای ڕووخانی دەوڵەتی میدیا بەدەستی فارسەکان، پاشا داریوشی فارس یەکەم ئاهورامەزداپەرست بووە لە مێژوودا و هەر ئەویش شازادە میدییەکان و نەوەی کەیخوسرەوی میدیا و زیاتر لە ٣٠ هەزار میدی لە هەولێر و هەمەدان قەتڵوعام کرد. ئایینی زەردەشتی هەر لەدوای داریوش و لەسەردەمی کوڕەکەیدا لە یەکتاپەرستییەوە بەرەو دووانەیی (دوالیزم) و فرەخواوەندی ڕۆیشت. هاتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی زیانێکی گەورەی بەم ئایینە گەیاند، دوای سێ سەدە لە فەرمانڕەوایی یۆنانییەکان ئایینەکە بەتەواوی بەرەو شێوان چوو. هەوڵی پاشایانی ئەشکانی و ساسانی بۆ زیندوکردنەوەی زەردەشتی و کۆکردنەوەی ئاڤێستا هەرچەندە سەرکەوتوو بوو، بەڵام زیاتر شێواندی، بە تایبەت لەسەردەمی ساسانییەکاندا. هەروەها دەرکەوتنی مەزدەکی و مانی بەهەمان شێوە بوونە هۆی کزی ئایینەکە. هاتنی ئاینی ئیسلام کۆتایی بە دەسەڵاتی سیاسیی و سەربازیی ساسانییەکان هێنا، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئیسلام ئەم ئایینە ڕووی لە کزی کرد، تا لە کۆتایی عەبباسییەکاندا بەتەواوی لە کوردستان نەما. ئەوەی جێگەی ئاماژەیە کە هەندێک لە ئایینەکانی ئەمڕۆی کوردستان وەک ئایینی یەزیدی و کاکەیی کەم تا زۆر پەیوەندییان بە زەردەشتییەوە نییە. ئەگەر لێکچوونێک هەبێت لە هەندێک ڕێوڕەسم و زاراوەدا، ئەوە واتای ئەوە نییە کە ئەو ئایینانە فۆرمێکی زەردەشتی دوای ئیسلام بن، بەڵکو بۆ نموونە لە ئایینی یەزیدیدا چەندین ڕەگ و ڕیشەی ئایینە کۆنەکانی میسۆپۆتامیا و ئایینی ئاسمانییەکان دەبیندرێت. لەبەر ئەوە یەزیدی ئایینێکە و کاکەییش ئایینێکی دیکە و زەردەشتیش ئایینێکی دیکە. ئەگەر شوێنکەوتووانی ئایینی کاکەیی و ئایینی یەزیدی بە تایبەت گەنجەکانیان ببنە شوێنکەوتەی ئەو گروپەی کە خۆیان ناو ناوە زەردەشتییە تازەکان، ئەوە دەکەونە هەڵەیەکەوە و بەناوی شوێنکەوتنی ڕەسەنایەتییەوە لەوانەیە لە داهاتوودا دوو ئایینی کۆنی کوردستان بفەوتێن ئەوانیش ئایینی کاکەیی و ئایینی یەزیدین. ئەمەش کتومت هەمان هاوشێوەی ئەو ترسەیە کە لە داهاتوودا فۆرمە سەلەفییەکەی سعودیە خەریکە فۆرمە کوردییە جوان و کراوەکەی ئیسلام بەناوی گەڕانەوە بۆ ڕەسەنایەتی و سەلەفی ساڵحەوە دەبەنەوە سەر ڕێبازێک کە فۆرمێکی خێڵەکی و سیاسیی بیابانی دورگەی عەرەبییە.

## سەرچاوە و پەراوێز:

1 بۆ نوێترین بۆچوون دەربارەی زەردەشت و بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتی بڕوانە ئەم بەرنامە دۆکیومێنتارییەی کەناڵی بی بی سی فارسی کە پسپۆڕانی ئەو بوارە لە چەندین زانکۆی بەناوبانگی ئەمریکی، بەریتانی و هۆڵەندی بۆچوونی خۆیان دەربارەی دەرکەوتن و ژیانی زەردەشت دەخەنەڕوو لە یوتوب بەرنامەکە بەم ناونیشانە هەیە.«BBC Persian – Great Iranians – Zoroaster زرتشت – March 20, 2012.»

2 Malandra, W.W., "Ancient Iranian Religion," Encyclopedia Britanicahttp://www.britannica.com/topic/ancient-Iranian-religion.

3 Radner 2003: 121.

4 RINAP I 16: 11-12.

5 Herodotus, Histories, Book 1.131; Freye, R.N., 1984 The History of Ancient Iran, Harvard University Press: p.81.

6 Roaf, M., and Stronach, D., 2007.

7 Luckenbill 1926, ARAB II 56.

8 Herodotus BookI.98, 1975, pp.128-131.

9 جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کە نیو سەدە لەمەوبەر هەندێک لە ڕۆشنبیرانی کورد ئەم ساڵی 612 پ.م یان وەک یەکەم ساڵی کوردی دەنووسی. بەڵام دوایی هەندێک لە مەسیحییەکان کە خۆیان بە ئاشوری دەزانن گلەیی ئەوەیان کرد کە چۆن دەبێت یادی روخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری ئێمە، بکرێتە یەکەم ساڵی کوردی! ئیدی لەوە بەدواوە ساڵی 700 پ.م کرا بە یەکەم ساڵی کوردی کە هیچ بناغە و بەسەرهاتێکی مێژوویی پشتگیری ناکات بەڵکو لەو ساڵەدا و 40 ساڵیش دوای ئەوەش میدییەکان هەر ژێردەستەی ئاشورییەکان بوون و خۆبەخۆ و جاسوسی و هاوپەیمانیان بۆ ئاشورییەکان دەکرد. لەبەر ئەوەی ئەو ساڵنامەیەی کوردی لە ڕووی مێژووییەوە بناغەیەکی نییە و ئەگەر بەکاریش بهێندرێت ئەوە ساڵی 612 پ.ز واتادارتر دەبێت. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکە ئەگەر بڕیارە میدییەکان باپیرانی کورد بن، ئەوە دەیان گەلی دیکەی کۆنتر لەوان لە کوردستان ژیاون و هەریەک لەوانە خاوەن ژیان و شارستانییەتی خۆیان بوون، هەموو پێکەوە باپیرانی کورد و کەمە نەتەوایەتییەکانی دیکەی کوردستان نەک بە تەنها میدییەکان.

10 Herodotus Book I .127.

11 Von Voigtlander, E.N., The Babylonian versions of the Achaemenian inscriptions, vol.2, London, 1978: 54.

12 Von Voigtlander, E.N., The Babylonian versions of the Achaemenian inscriptions, vol.2, London, 1978: 57-58.

13 Von Voigtlander, E.N., The Babylonian versions of the Achaemenian inscriptions, vol.2, London, 1978: section 26.

14 Von Voigtlander, E.N., The Babylonian versions of the Achaemenian inscriptions, vol.2, London, 1978: pp.54-55.

15 Mallowan, M.E.L. 1996: *Nimrud and Its remains, pl.134, fig.2, 20.*

16 Worshipping fire in Meseopotamia and the Zagros, pre-Zoastrian practices.

17 عبدالقادر حسن التكريتي، 1960" حفريات تلا لديم في حوض دوكان،" مجلة سومر، العدد 16،جزء 2-1،ص -93 110.

18 Herzfeld , E., 1947, Zoaster and his words,. Princeton University Press, Brinceton. Vol i-ii: 433-494.

19 Herzfeld , E., 1947, Zoaster and his words,. Princeton University Press, Brinceton. Vol i-ii: 516-542.

20 Herzfeld , E., 1947, Zoaster and his words,. Princeton University Press, Brinceton. Vol i-ii: p. 543.

21 بڕوانە گۆڤاری سوبارتو ژمارە 2، ساڵی 2008، لا (59-57).

22 Jackson, A.V. Williams, 1965 Zoastrian Studies, the Iranian Relisgion and Various Monographs, AMS Press INC. New York, p. 27.

23 بڕوانەفؤاد حمة خورشيد (درايڤەر) الكورد في المصادر القديمة.

24 ڕێزان قادر غەفوری، "شاژنە هێلینا سەتێرەی درەوشاوەی مێژووی ئەربێلا و ئەدیابین،" گۆڤاری سوبارتو ژمارە 8، 38-32.

25 ئەمە وتاری پیاوێکی ئایینی مەسیحییە و چیرۆکێک دەگێڕێتەوە دەربارەی مار قەرەداغ، بێگومان وەک حەکایەت وایە و تەنها بۆ ئەوە لێرەدا ئاماژەی پێدەکەم تا خوێنەر بزانێت کە ئەم کەسایەتییە کوردانە (مار شیرین، مار بەهنام، مار قەرەداغ) لە ئەدەبیاتی مەسیحییەکانی کوردستان و عێراقدا، وەک قەشەیەکی شەهید و موبارەک سەیردەکرێن.

الشماس: نوری ايشوع مندو، تذكارمار قرداغ الشهيد،

http://www.kaldaya.net

